علي خان

هەڵسەنگاندنی

# وتەکانی فەلسەفەخوازێك

## لە تەرازوی عەقڵ ومەعریفە وواقیعدا

((گفتوگۆیەك لەگەڵ د. فاروق رەوفیق))

لەگەڵ

# گۆشتی بەراز خۆشە یان وشتر؟!

((گفتوگۆیەك لەگەڵ مەلا بەختیار))

چاپی یەکەم ١٤٣٨

ناوی کتێب: هەڵسەنگاندنی وتەکانی فەلسەفەخوازێك لە تەرازوی عەقلّ ومەعریفە وواقیعدا
نوسەر: عەلی خان
بڵاوکردنەوەی:
نۆرە وساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٨ - ٢٠١٧ز
شوێنی چاپ
تیراژ:

بسم الله الرحمن الرحيم

# دەستپێك

سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ پەرستراوی هەق، سوپاسێك شایستە بێ بە جەلالەت وگەورەیی ئەو، بەردەوام بێ بە بەردەوامی ئەو، قورس وسەنگین بێ بە سەنگینی عەرشی ئەو، فراوان وزۆر بێ بە زۆری دروستکراو ووشەکانی ئەو، زانا وئاگادارە بەوەی بووە وبەوەشی ئەبێ، بەوەی نەبوە وبەوەشی نابێ، گەر ببوایە چۆن دەبوو، بۆ نەبووە وبۆ نابێ؟ بیسەر ودانا وزانا وکار لەجێ وبەجێ لە بۆ ئەوەی دەشێ ولەو کاتەی بشێ، بەرزی وپیرۆزی ومەزنی بۆ ئەو خوایەی کە گەڵایەك لە دارەکەی بەر نابێتەوە مەگەر بە زانستی ئەو نەبێ.

شایەتی ئەدەم کەوا موحەممەد بەندە وپەیامبەر وڕەوانەکراوی خوایە، «سوێند بەخوا هیچ شتێك نەما لە هەق وڕاستی، لەوەی سودی بۆتان هەبێ مەگەر بۆم ڕونکردونەتەوە وپێم ڕاگەیاندون، هیچ شتێکیش نەماوە لە لاری وچەوتی، مەگەر بێدارم کردونەتەوە لێی وپێم ڕاگەیاندون»، داوی ئەوە:

لەم ماوە لە یەکێك لەو کەناڵە ئاسمانیانە چاوپێکەوتنێك کرا لەگەڵ دوو عەلمانی لەمەڕ شیاوی دەستوری عەلمانی وبێکەڵکی دەستوری ئیسلامی، جا بەهۆی هێرشی زۆریان بۆ سەر ئیسلام وموسڵمانان، کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە، منیش لێرەدا لەسەر هەندێ قسەی نێو

بەرنامەکە پشتیوان بەخوا هەڵوێستە دەکەم، ولەم چەند خاڵەی خوارەوە دەیگوشێرم[1]:

## کێشە گەورەکە ناشارەزایی وگە نحاڵی بوونی نەیارانی ئیسلامە لە ئیسلام

**پێشتر وتومە وئێستاش دەیڵێم:** کێشە گەورەکەی ئێمە لەگەڵ نەیارانمان بریتیە لە ناشارەزایی ونا حاڵی بوون وگەنحاڵی بوونیان لە ئیسلام، دەی: «الحُكْم عَلَى الشَّيْءِ فَرْعٌ عَنْ تَصَوُّرِه»، کە تۆ حوکم دەدەیت لەسەر شتێك بەگوێرەی ئەوە دەبێت کە لەوشتە حاڵی بووی -ئەمە ئەگەر هەوا وئارەزو ببەینە دەرەوە کە من پێم وایە پشکی شێری هەیە لەو بڕیار ودیدە هەڵانەی لەسەر ئیسلام دروست دەبن ودەدرێت-.

## بۆ دەستورێکی ئیسلامیمان دەوێت؟

بڕۆمە سەر باسی ئەوەی: **بۆ دەستورێکی ئیسلامیمان دەویٚ؟**

هەڵبەت لەبەر زۆر خاڵ؛ گرنگترینیان: ئێمە وکۆمەڵێك لە عەلمانیەکانیش ئەڵێین: ئەم خاك وهەوا وئاو وئاسمان وشەو ورۆژ و ... هتد هەمووی دروستکراوی خوایە ﷻ، ئایا بەبێ ئەم دروستکراوە ورد وموحکەمانەی خوا ژیان بەردەوام دەبێت؟ بێگومان نەخێر، بۆچی؟

---

(١) هەر ئەو کاتە لە «گۆڤاری وەلأم» بلاوکرایەوە.

چوونکە خوا ﷻ خۆی دروستکاری هــەموو بونــەوەرە وزانایــە بــە هــەموو شتێك وبە نهێنی وئاشکراکان، دانایە کە چی شیاوە، بۆ کەی شــیاوە، وبــۆ کویّ شــیاوە، وچــۆن شــیاوە ...، یــا نەشــیاوە بــۆ نەشــیاوە؟ بــەو شــێوە خولقاندوویەتی کە بشیّ وبگونجیّ.

بۆیە ئەم ژیانە ئاوها جوانە وگوزەران بەردەوامە، دەبینی ئاسمان شــینە ڕەش نیە، ئەگەرنا ئــەو جوانیــەی نــەدەما، هــەوا ڕەنگــی نیــە، ئەگــەرنا یەکترمان نەدەبینی، نە قورسە ونە سوکە ئەگەرنا دووایی بمانویستایە هەوا هەڵبمژین یان ئەبوایە سەرمان بنوسایە بە خاکــەوە، یــان ســەربکەوتینایە بەسەر شتێك تا تۆزێــك هــەوا هەڵبمــژین -ئەمــە ئەگــەر ژیــان مــابیّ-، هەروەها ئاو، نە تام ونە بۆن ونە ڕەنگی نیە. ئەگــەرنا هەنــدێك تەبیعــەت حەزی لە هەندیّ بۆن وتام وڕەنگ نیە.

ئەمە خەلقی خوایە وهەمووومان پێمــان وایــە عــەیبی نیــە، ئــەی بــۆ ئەبێت خەلقەکەی بیّ عەیب بێت بەڵام شەرعەکەی عەیبدار بێــت؟! ئەمــە هەر بۆ خۆی نەسازی ودژ بەیەکی «تناقض» نیە؟! هەربۆیە چۆن بــەبیّ ئــەم نیزام وسیستەمە گەردوونیەی خوا -إن صح التعبير- دایناوە ژیــان نابێــت، بەبیّ ئەو سیستەمەشی بۆ ژیانی خەڵکی داناوە -کــە شــەریعەتەکەیەتی- ژیان بە ڕێکی ناڕوات.

یانی تۆ ئەگەر بە گوێرەی کەتەلەۆك ئەو ئامێرە بەکارنەهێنی، نابێت، بۆ نمونە هەندێك ئـامێری کارەبـایی ئـەبێ کـە لـەبار داتگـرت بـۆ چـەند سەعاتێك داینەگیرسێنی، ئاوها نوسراوە، کـە وات نـەکرد ئەوسـا ئەگـەر خۆی دە ساڵ ئیش بکـات، بـۆ تـۆ لەوانەیـە مانگێـك ئـیش بکـات یـان ڕاستەوخۆ بسوتێت.

جا ئەگەر عەلمانیەت پیادە بکەین، ئا بەو چەشنە ژیان تێك دەچێت.

بۆیە ئەڵێین: ئەبێت ئیسلامەکەی خـوا دەسـتور بێـت ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾. واتە: «وڕازی بووم ئیسلام دینتان بێت، بۆیە پێـوەی پابەنـد بن».

ئەمەش واتای: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ە. واتـە: «دروستکراوەکان هەمووی هی خوان، وفەرمانەکانیش هەر بۆ ئەون».

هەروەها دەستوری عەلمانیەتمان ناوێ، چوونکە بەڕاستی زۆر ناشیرینە، ئەوشتە جوانانەی تێیدایە ئیسلامەکەمان دەستەبەری کردووە -الحمد لله-، ئیتر بۆ واز لەو خوانە جـوان وڕازاوەی خـوا بهێـنین وڕوبکەینـە زبڵدانەکـە وبڵـێین: ئـەو خواردنـە لـەم زبڵدانـە هەیـە بـەتامترە لـەوەی سـەر سـفرە وخوانەکە.

## عەلمانیەت خۆی شێواوە یا دەشێوێنرێ؟!

**ئەڵێ: «دەستێك هەیە كە سیكۆلاریزم دەشێوێنێ».** نا، نەخێر، بەڕێزان دوونیا ڕۆشنە وخەڵك چاوی هەیە، بە خەڵك وتراوە: عەلمانیەت نێر لە نێر مارە دەكات، بەمە عەلمانیەت دەشێوێنرێ یا هەر خۆی شێواوە؟! ئەمە هەقیقەتە وخەڵك لە كەناڵەكان بەچاوی خۆیان دەیبینن!

## عەلمانیەت ئایدۆلۆژیا؟!

**ئەڵێ: «عەلمانیەت ئایدۆلۆژیا نیە».**

ئەمە یا چەواشەكردنە، یان تێنەگەیشتنە لە مانای ئایدۆلۆژیا، ئەگەرنا ئایدۆلۆجیا واتە ئەفكار وئاراێ وعەقائید! بە كوردی بیروباوەڕ وفیكر وڕاوبۆچوون دەگەیەنێت. ئیتر چۆن عەلمانیەت بیروباوەڕ وفیكر نیە؟! ئەگەریش وەكو زاراوەیەك تەماشای بكەین: لە كتێبی: «اللغة العربية المعاصرة»دا هاتوە ئەڵێ: «مجموعة الآراء والأفكار والعقائد والفلسفات التي يؤمن بها شعب أو أمّة أوحزب أو جماعة»[1]، واتە: «بریتیە لە كۆمەڵە ڕاوبۆچون وفیكر وبیروباوەڕ وفەلسەفەگەلێك كە گەلێك یان ئوممەتێك یان حیزبێك یان جەماعەتێك بڕوای پێیەتی» كەواتە هەر ڕاوبۆچوونێك هەبێت

---

(١) «اللغة العربية المعاصرة» تأليف: أحمد مختار عمر، الطبعة الأولى، ١٤٢٩ – ٢٠٠٨، دار عالم الكتب، القاهرة. (١/١٤٤) رقم: (٣٨١) أيدوولوجية.

هــەر کۆمــەڵێك بڕوایــان پێــی هــەبێت ئــەوە ئایدۆلۆژیایــە، لەوانــەش عـەلمانیەت.

هەروەها لەوەودووا خوا ویستی لێبێت لە فەرهەنگە بیانیەکانەوە ئەوە دەبینیت کە سیکۆلار وعـەلمانیــەت ئایدۆلۆجیایــە وبــوواری گومــانی تێــدا نامێنێت.

## بۆ دژی تێپەڕاندنی ماددەی شەشن؟

**ئەڵێ: «دژی تێپەڕاندنی ماددەی شەشم»**. با بەوە دەسـت پێبکـەین بزانین ماددەی شەش چی ئەڵێ کە ئـەمان دژیــن؟ ئـەڵێ: ئـاییـنی ئیسـلام سەرچاوەی سەرەکی یاسادانانە.

ئەی با بزانین بۆ دژین؟ وەڵام: «**لەبەر ئەوەی ئیسلام حوکمی بەربەری تێدایە** -کە دەقی قسەی خۆیانە لەبەرنامەکەدا-».

کە ئەوەشمان زانی با بزانین، ئەو دوو ڕۆشنبیرە! دەیانفەرمو: دژی ئاییـنی ئیسلام نین.

بەڕێزان کەواتە لە خۆیان بپرسن: هەر بەڕاست دژی حـوکمی بەربــەری نین؟! یان ئەتانەوێ بە قینــاعی دژی دیــن نـین، ژەهــر تێکـەڵی هــەنگوین بکەن؟!

پاشان بـۆ ڕاسـتەوخۆ بانگەشـەکەتان ناکـەن؟ مەگـەر خۆتـان نـاڵێن ئیسلامیەکان کەمینەن!؟

بۆیە لێرەوە موسڵمانان ئاگادار دەکەمەوە لەو خەڵکانەی کە دژایەتی دین دەکەن بەڵام بەناوی دڵسۆزی بۆ دین: یەکێکیان ئەڵێ: دەستوری ئیسلامیمان ناوێ تا ئیسلام پارێزراو بێت لە توندووتیژی. ئەوەکەیان ئەڵێ: دەستوری دینیمان ناوێ بۆ ئەوەی وێنەیەکی جوانی ئیسلام پیشانی جیهان بدەین، ئەمەکەی تریان ئەڵێ: لەبەر خاتری موسڵمانان داوای دەستورێکی سیکۆلار دەکەین تا موسڵمانان بە ئاسودەیی بژین!! ئەوەکەی تریان ئەڵێ: سیکۆلار واتە ڕزگارکردنی ئیسلام لە دەست ئیسلامی سیاسی! ئەمە بریتیە لە فەلسەفەی: نابیتە ئیسلام تا واز لە ئیسلام نەهێنیت!

## پێناسەی دروستی عەلمانیەت وهەقیقەتەکەی

ئەڵێ -لەپێناسەی هێزی سیکۆلار-: «**هێزی سیکۆلار ئەو هێزەیە: نە مولحیدە، نە دژایەتی ئایین دەکات، بەڵکو ئەڵێ دەوڵەت ئاینی نیە، دەوڵەت موقەددەس نیە، قودسیەت لە دەوڵەت دائەماڵێ، ودەوڵەت ئەبێت پارێزەری ئازادی هەموو لایەك بێت، لەوانە ئازادی ئاینی**».

پێش هەمووشتێك ئەڵێم: پێویستیمان بە پێناسەی تۆ نیە، ئەوە دائیرەی مەعاریفی بەریتانیە ئەڵێ:

Secularism: any movement in society directed away from otherworldliness to life on earth.

«هي كل حركة اجتماعية تهدف إلى صرف الناس وتوجيههم من الاهتمام بالآخرة إلى الاهتمام بهذه الدنيا وحدها».

واتە: «هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیە ئامانجی پاشگەزکردنەوەی خەڵکە لە بایەخدان بە دوارۆژ بۆ بایەخدان بە دوونیا بە تەنها» ودوونیا نەویستەکان بکاتە دوونیا ویست.

هەروەها لە فەرهەنگی «العالم الجديد»ی لۆبستردا لە باسی وشەی «Secular»دا ئەڵێ: «الاعتقاد بأن الدين والشؤون الكنسية لا دخل لها في شؤون الدوولة وخاصة التربية العامة» واتە: «بیروبڕوابوونە بەوەی کە دین وکاروباری کڵێسا هیچ هەقی نیە بە کاروباری دەوڵەتداری وبەتایبەت پەروەردەی گشتیەوە».

ولە فەرهەنگی ئۆکسفۆردا هاتوە ئەڵێ: «secular: دنيوي، أو مادي، ليس دينيًا ولا روحيًا؛ مثل التربية اللادينية، الفن أو الموسيقى اللادينية، السلطة اللادينية، الحكومة المناقضة للكنيسة» ئەڵێ: «سیکۆلار واتە دوونیاگەرایی، ماددەگەرایی، نە دینی ونە ڕوحی، وەکو پەروەردەی لادینی، هونەر یان مۆسیقای لادینی، دەسەڵاتی لادینی، حکومەتێك کە هەڵوەشێنەرەوەی کڵێسا بێت». هەروەها باسی واتایەکی تری دەکات وئەڵێ: «الرأي الذي يقول: إنه لا ينبغي أن يكون الدين أساساً للأخلاق والتربية» واتە: «ئەو ڕاوبۆچوونەیە کە پێی وایە: نابێت ئایین بنەما بێت بۆ ڕەوشت وپەروەردە».

جا بێینەوە سەر وەڵامی دوو هاوڕێکەمان، کە ئەڵێ: «**سیکۆلار نە مولحیدە**» ئەوە سایت وپەیج وچالاکی وگۆڤار ورۆژنامەکانیانن شاهیدی لەسەر ئەمە دەدەن یان بە درۆی دەخەنەوە؟! وا دەزانم زۆربەی دووەمە.

پاشان ئەگەر عەلمانیەت واش نەبێت، بەڵام ئەو کەش وهەوایەی دەیخولقێنێ کەشوهەوای دارمانی ڕەوشت وئەخلاق وبەها باڵاکان وبڵاوبوونەوەی ئیلحادە. **ئەگەر عەلمانیەت ئیلحاد نەبێت ڕێخۆشکەرە بۆی. ئەگەر عەلمانیەت پیاو لە پیاو مارەکردن نەبێت لێکەوتەکەیەتی.**

سەبارەت بەوەی: «**سیکۆلار دژایەتی ئایین ناکات**»، ئاخر بەڕێزان نیوەی بەرنامەکە سوکایەتی بوو بە ئایین وەك باسی هەندێك لەوانە دەکەین -بە ویستی خوا-، ئیتر نمونەی دەرەکی پێویستە؟!

پاشان مێژو وواقیعی عەلمانیەکان شاهیدە لەسەر ئەمە، کەمال ئەتاتورکی عەلمانی دژایەتی ئاینی نەکرد، ئازادیە ئاینیە تاکەکەسیەکانی قەدەغە نەکرد؟! لە دایکی دیموکراسیەت لە فەرەنسا حیجاب قەدەغە نیە؟! لەناو جەرگەی ئەوروپا ڕۆژنامە جیهانیەکانیان باسی ئەوە ناکەن کە موسڵمانان ڕوبەروی دژایەتی دەبنەوە؟! لەو وڵاتە ئەوروپیانە، کوشتنی موسڵمانێك ونا موسڵمانێك وەك یەك نیە، لە ئەمریکای عەلمانی لە سەردەمی ترەمپدا دەزانی لەیەك ڕۆژدا چەند هێرش دەکرێتە سەر موسڵمانان؟ ناکرێ بڵێی ئەمانە ڕای شەخسین وتەعبیر لە عەلمانیەت

ناکەن، بەڵام موسڵمانێك بێت تەعبیر لە ئیسلام دەکـات. ودەیـان نمونـەی تر.

## دەوڵەت عەلمانی بوو، ئاینەکەشی عەلمانیە

سەبارەت بەوەی: «**سـیکۆلار ئەیـەویَ دەوڵـەت بـیَ ئـاین بێـت**»، بێگومان ئەمە قیناع وچەواشەکاریە، ئەگەرنا دین چـیە؟ دیانـەت بریتیـە لەوەی مرۆڤ باوەڕی پێیەتی: «مَا يتدين بِهِ الْإِنْسَان»[1] هەرچیەك بێت ئـەرزی بێت یان ئاسمانی، لەو دینانە: ئیسلام، جولەکە، گاور، بووزی، عـەلمانیـەت، شیوعیەت...هتد. ئەمانە هەمووی دینن، مرڤەکان باوەڕیان پێیەتی.

هەربۆیە دەوڵەت عەلمانی بوو ئەوسا ئایینی عەلمانیەت دینی دەوڵەتە! کەواتە ئەم بانگەشە دژ بە یەك ونەسازە.

لەمەوە ڕون بوویەوە کە ئەم بانگەشەیە مەحـەللی لـە ئیعرابـدا نیـە، ئەگەرنا کەسی ڕۆشنفیکر نابیَ هەڵە وقسەی دژبەیەکی وا بکات!

(١) «الدّيانَة: مَا يتدين بِهِ الْإِنْسَان». «المعجم الوسيط» تأليف: إبراهيم مصطفى، أحمد حسن الزيات، حامد عبد القادر، محمد علي النجار، مادة د ي ن، (ص ٣٠٧)، الطبعة السادسة ١٤٢٩، الناشر: مؤسسة الصادق للطباعة والنشر، طهران.

## وڵاتانی ڕۆژئاوا لە دەستور باسی ئاینی فەرمی دەکەن

هەروەها ئەکرێ لە ڕوانگەیەکی ترەوە هەڵوێستە لەسەر ئەم قسەیەی بکەین، کە بۆت دەردەخات هەندێك ڕۆشنبیر نازانن چی ئەڵێن، گرنگ کردنی قسەی زلە!

ئەویش ئەوەیە کە ئەڵێ: «**دەوڵەتی سیکۆلار ئاینی نیە**». کەچی زۆرێکی وڵاتانی ڕۆژئاوا ئاینی فەرمی وڵاتیان گاورە، ئیتر کاسۆلیکی بێت یان پرۆستانت یان ئەرسۆزدۆکسی یا هەر ئاینزایەکی تر[1]، بۆ نمونە:

## دەستوری نەرویج: ئاینی فەرمی ئینجلیکانی پرۆتستانتی لۆسەریە

وڵاتی نەرویج وڵاتێکی ئەوروپیە، نیزامی پادشاییە، لە ماددەی دووی دەستوردا دیانەتی کڵێسای[2] ئینجلیکانی[3]

(١) کە من لێرەدا بە زۆری باسی وڵاتانی ڕۆژئاوا دەکەم وباسی ئاینی نەسڕانیەت دەکەم، لەبەر ئەوەی ئەوان زۆرتر بڕوایان بە ئەوروپا هەیە وزیاتر لە فریشتەوە نزیکە!

(٢) واتە: کەنیسە، یانی: پەرستگا، وەك مزگەوتی موسڵمانان. مەبەستیش لە کڵێسا ئەو بۆچوونەوەیە کڵێساکە هەڵی گرتوە، نەك چووار دیوار.

(٣) یا ئینگلیزی، یەکێکە لەو بۆچوونانەی شوێنی کڵێسای ئینگلیزی دەکەوێت. ئینگلیزیش نیسبەتە بۆ وڵاتی ئینگلتەرا (بریتانیا). بڕوانە: «**المورد الحديث**» **تأليف: منير البعلبكي، ورمزي منير البعلبكي**، وشەی «Anglican» ل ٥٩، **دار العلم للملايين**، بەبێ ساڵی چاپ، بیروت.

پرۆتستانتی[1] لۆسەری[2] بە دینی فەرمی وڵات دادەنێت، وپێویستە دانیشتوانی وڵات نەوەکانیان لەسەر ئەوجۆرە ئایدۆلۆجیایە پەروەردە بکەن.

---

(١) گروپێکی گەورەن لە سێ گروپە گەورەکەی گاورەکان «پرۆتستانت، کاسۆلیك، ئەرسۆدۆکس»، وبە ئینجیل وعەقڵ ئیعترازیان کردە سەر کڵێسای ڕۆژئاوایی (کاسۆلیك) (بەرامبەر کڵێسای ئەرسۆدۆکس کە پێی ئەوترێ ڕۆژهەڵاتی چوونکە شوێنکەوتوانی بە زۆری لەوێن)، بۆیە لە کاسۆلیکەکان جیابوونەوە (وەکو چۆن ئەرسۆدۆکسیش لە کاسۆلیك جیابوونەتەوە)، کڵێسەکەشیان پێی دەوترێت: پرۆتستانت، لە «protest»ەوە هاتوە، واتە ئیعتراز، چوونکە ئیعراز دەکەنە سەر هەر شتێك دژی ئینجل بێت، وتەنها شوێنی ئەو دەکەون، بۆیەش پێیان دەوترێت «ئینجلی»، وپێشیان وایە هەموو کەسێك دەتوانێت لە ئینجیل تێبگات. بڕوانە: «**الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة**» **إشراف: مانع بن حماد الهجري (٦١٥/٢)، الناشر: الندووة العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الخامسة ٢٠٠٣.**

(٢) نیسبەتە بۆ مارتن لۆسەر کینگ، کە یەکێکە لە ڕاهبە گاورە بەناوبانگەکان، لە ئەڵمانیا لە دایکبووە لە ١٤٨٣، کە ئەو هەموو بۆچۆنە خورافی وپوچەی گاورەکانی بینیوە بە تایبەت دووای ئەوەی لە ١٥١٠ سەردانی ڕۆمای کرد بۆ تەبەروك کردن بە پیرۆزییەکانی ئەوێ، بینی: ئەمە بۆ لێخۆشبوونی تاوانە، ئەوە نهێنی تەوبەکردنی لایە، وئەمە پێدانی چەکی لێخۆشبوونە، وئەم هەموو دیاردەی گەندەڵی وبەدڕەوشتیە هەیە لە سلکی ڕاهب وگاورە دیندارەکاندا، بۆیە بزوتنەوەیەکی چاکسازی دروستکرد لە ناو مەسیحیەت، ئەوەبوو بە بڕیاری پاپا لە ساڵی ١٥٢٠ بێبەش دەکرێت، دوواجار دەڕوات عەهدی جەدید (بەشێکی ئینجیل) وەردەگێڕێتە سەر زمانی ئەڵمانی، کە شتی وا لەو ئاینەدا قەدەغەیە وپاپا وگەورە پیاوانی ئەو ئاینە ئەتوانن لە ئینجیل تێبگەن نەك وەربگێڕدرێت بۆ هەموو کەسێك، هەربۆیە بۆچوونی لۆسەر ئەوەندە کاریگەری دەبێت، کاتێك ئیمپراتۆڕ داوای بە دەستەوەدانی لۆسەر دەکات لە ئەڵمانیا، دەسەڵاتدارانی ئەوێ ئەڵێن: بەسەرچاو ئێمە ئامادەی گوێڕایەڵی ئیمپراتۆرین لە هەمووشتێکدا مەگەر شتێك

هەروەها لە ماددەی چواردا ئـەڵێت: پێویســتە پاشــا لــە هــەڵگرانی بیرباوەڕی کڵێسای پرۆتستانتی لۆسەری بێت.

جا ئەمە وەکو ئەوەیــە وایــە بڵێــی: ســەرۆکی عێــراق یــان ســەرۆکی هەرێمی کوردستان، ئەبێت: موسڵمانێکی[1]، سوننی[2]، شافعی[3]، بێت.



شایانی باســە ئــاڵای وڵاتــی نــەرویج بریتیــە لــە خاچێك. هەروەها دروشمەکەشیان دیسانەوە خاچــێکی تێدایە لەسەر تاجەکە، جا هەتا ئەو ڕادەیە ئایینین!



دووێنێ «٢٨,٧,٢٠١٥» یەکێك لەو عەلمانیە لاڕەوانە -لــە کەناڵێکی ئاسمانیەوە- دەیوت -هەڵبــەت عــەیبی نــەدەهات-: «بــەڵگەی ئەوەی سەددام عەلمانی نەبووە ئاڵای وڵاتەکەیەتی کــە «الله أکبر»ی تێدایە!».

تۆ بڵێی نەرویج عەلمانی نەبێت، چوونکە ئاڵاکەی خاچی تێدایــە؟! یــان ئەو وڵاتانەی ئێستا باسیان دەکــەین؟! ئەگــەر ئــەم وڵاتانــەی ئێســتا مــن

---

دژی کتێبی پیرۆز بێت ویان هیچ دەقێك لەســەری نــەهاتبێ، بۆیــە تەسـلیمیان نــەکرد، ئەمەش خودی ئەو بۆچوونەوە بوو لۆسەر بڵاوی دەکردەوە.

**لۆسەریش** بەوکەسانە دەوترێت بۆچوونی ئەمیان ئەڵگرتوە وژمارەیان سەدان ملیــۆن کەسە.

(١) بەرامبەری گاور «مەسیحی».

(٢) بەرامبەری پرۆتستانت.

(٣) بەرامبەری لۆسەری.

باسیان دەکەم عەلمانی نەبن، لە هەموو دوونیا وڵاتی عەلمانی نیە، کە ئەوانەی شارەزای عەلمانیەتن وخەریکن پێوەی دەزانن نەرویج لە سەروی لیستی ناوی وڵاتانی عەلمانیە!!

هەر بۆ زانیاریتان یەکەم زۆرترین ناو لە نەرویج: «لۆقا یان لۆگا»یە، کە ناوی ئینجیلێکە لە چووار ئینجیلەکە، دووای ئەوە ناوی: «مورقوس» «مُرقُس»، کە ناوی ئینجیلێکە لە چووار ئینجیلەکە، پاشان ناوی: «فیلیپ»، کە ناوی قەشە فیلیپە، کە یەکێکە لە دووانزە پەیامبەرەکەی لای ئەوان، ئینجا: «یەعقوب» یەعقوبیش دیارە واتە: «ئیسرائیل». ئەمە لە نێرینە، لە مێینەش: «لینیا» کە لە «مجدلین MAGDALENE» ەوە وەرگێراوە، کە ئەسڵەکەی «مجدل»ـە وشوێنێکە لە فەلەستین، پاشان: «تیا»، کە لەو هێماوە وەرگیراوە وا لەشێوەی خاچە لەسەر گۆنا، ئەم زانیاریانەشم پشتیوان بەخوا هەموویم ڕاستەوخۆ لە سایتی فەرمی وڵاتی نەرویجەوە وەرگرتوە ودەستی تری نەبینیوە، تەنها واتاکان نەبێت لە فەرهەنگەکانەوە دەرمهێناوە.

ئەمە وڵاتە عەلمانیەکانیان ئاوهایە تۆ بڵێی وڵاتە دینیەکانیان چۆن بێت؟!

## ئینجلیکانی پرۆتستانتی لۆسەری، ئاینی فەرمیە لە دەنیمارك

وڵاتـی دەنیمـارك ئەندامــە لــە یــەكێتی ئــەوروپا، نیزامــی پادشــایی دەستوریە[١]، لە ماددەی چووار بڕگەی یەك لە دەستوردا ئەڵێت: «كڵێسای



ئینجلیكـانی لۆســەری «پرۆتســتانتی» بریتیــە لــە كڵێســای فــەرمی وڵات، ... هەربۆیــە لەلایــەن دەوڵەتەوە پشتگیری وهاوكاری دەكرێت». هەروەها لە



ماددەی دوو بڕگەی شەشەم ئەوەی تێدایە: «كە ئـەبێت پادشا ئەندام بێت لە كڵێسای ئینجلیكانی لۆسەری». هەروەها ئاڵای وڵاتی دانیماركیش بریتیە لە خاچـێك. جـگـە لە دروشمەكەیان، كە خاچی تێدایە.

## ئاینی فەرمی ئایسلەندا، دەستەی پرۆتستانتی لۆسەریە



كۆماری ئایسلەندا وڵاتێكی ئەورووپیــە وئەیــەوێ ببێ بە ئەندام لە یەكێتی ئــەوروپا، بەهــەمان شـێوە دینی فەرمی وڵات دەستەی پرۆتســتانتی لۆســەریە، ئەبێت دەوڵەت پشتگیری وهاوكـاری بكـات. ئـاڵای



وڵاتی ئایسلەندا -بـە هــەمان شـێوە- بریتیــە لــە: خاچێك، ودروشمەكەشیان خاچێكی زەقی تێدایە.

---

(١) واتە: مومارەسەی دەسەڵاتی دەكات بە پێی دەستور ویاسا ورەها نیە.

# ئاینی فەرمی بریتانیا مەسیحی پرۆتستانتە

وڵاتی بـەریتانیا ئەنـدامی یـەکێتی ئەوروپایـە[1]، نیزامـی پادشـایی دەستوریە، دیسانەوە دینی فەرمی گاوری پرۆتستانتە. بـەڵێ دەسـتورێکی نوسراو نیە، بەڵام دەستورێکی عورفیە نەوە بۆ نـەوە ماوەتـەوە. بـەڵام لـە ماددەی سێی یاسای «التسوية»دا ئەڵێ: پێویستە پادشا لـە شـوێنکەتوانی کڵێسای ئینگلتەرای پرۆتستانت بێت، هـەروەها ئـەبێت پادشـا سـەرۆکی کەنیسە بێت، وبڕیاری ڕاشکاویان هەیە کە هەڵگرانی بیروباوەڕی کەنیسەی کاسۆلێکی[2] مافی ئەوەیان نیـە دەسـەڵاتی بـەریتانیا بەدەسـتەوە بگـرن.



وئـاڵای وڵاتـی بــریتانیا دیـسانــەوە خـاچـێکی زەقـی تـێدایـە، ولە دروشمەکەشیاندا سێ! خاچ.



هەروەها لە بریتانیـا ئەنجومـەن «پەرلـەمان»ی لۆردەکـان «House of Lords» لـە دوو جـۆر لۆرد پێکهاتوە، بەشێکیان لـۆردە ڕوحیـەکانن وژمارەیـان بیسـت وشـەش

---

(١) ئەمە ئەو کاتەبوو، بەڵام لەم ڕۆژانەدا ڕاپرسی (ئەوەی پێی ئەڵێن ڕیفراندۆم) کـرا بۆ دەرچوونی لە یەکێتی ئەوروپا وسەری گـرت وئامادەکاریـەکان ڕێکـدەخرێن بـۆ ئـەو مەبەستە.

(٢) یەکێکـە لـە سـێ مەزهەبـە گەورەکـەی مەسـیحیەکان بـەڵکو گەورەترینیانـە ودایکیانە ودووانەکـەی تـر لەمـەوە جیابوونەتـەوە. هەرکـەس پاپـای کڵێسـای ڕۆمـا (فاتیکان) بە گەورەی خۆی بزانێت کاسۆلیکیە. لە دیارترین ڕابەرانی: بۆڵس وبەترِسن.

کەسە. کە نوێنەرایەتی بەرزترین کەنیسەی ئینگلیزی دەکەن، دەشتوانن ڕێگر بن لە پەسەندکردنی زۆر یاسا[1].

کە باسی بریتانیام کرد با باسێکی ئەوەش بکەم: لە ساڵی ٢٠١١ کامیرۆنی سەرۆك وەزیران وتی: «بریتانیا دەوڵەتێکی مەسیحیە ونابێت شەرم لە وتنی ئەوە بکەین». هەر لەویٚ بەرگری لە ڕۆڵی دین کرد لە سیاسەتدا.

هەروەها دەستخۆشی لە قەشەکان کرد بەهۆی وەرگێڕانی جۆرێکی ئینجیلەوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وبە دەستکەوتێکی گەورەی زانی. وئەڵێ شانازی دەکەم بە مەسیحیەتی خۆمەوە. هەروەها وتی: حەز دەکەم ئەوە بڵێم: ئینجیل بریتانیای گەیاندۆتە ئەمڕۆ[2].

## دەستوری ئیرلەندا : دەسەلات هێز لە خواوە وەردەگرێت

کە باسی بریتانیام کرد، با باسێکی ئێرلەنداش بکەم، چوونکە ئەوانەی سەر لە مێژوی ئەوروپا دەردەکەن دەزانن ئێرلەندا لە بریتانیا جیا بۆتەوە، وچ کێشەیەکی لێکەوتەوە. چوونکە هۆکاری جیابوونەوەکە هەر دینی بوو، کێشەش کە دروست بوو هەر دینی بوو، چوونکە ئێرلەندا

---

(١) لە هەر وێنەیەك خاچەکان بە ڕونی دەرنەکەون گەورە کراونەتەوە تا زیاتر دەربکەون.

(٢) www.gov.uk/government/news/prime-ministers-king-james-bible-speech.

کاسۆلیکی بوون[1]، بەریتانیاش پرۆتستانت، جا دووای کوشتار وبڕینێکی زۆری سەدان ساڵە جیابوونەوە، ئەوەبوو باکوری ئێرلەندا کە پرۆتستانت بوون دژی ئەمە وەستانەوە ولەگەڵ بریتانیا مانەوە. جا ئەگەر لای خۆمان بووایە ئەیانوت ئەمانە جاش وخۆ فرۆشن لەبەر دین لەگەڵ جیابوونەوە نین، کە تەنانەت هەندێکیان ئەڵێن ئێرلەندی نەتەوەیەکی جیاوازە لە بریتانی.

سەرەتای دەستوری ئێرلەندی کە هەندێك بۆ جیاکردنەوەی لە ئێرلەندای باکور ئەڵێن: «کۆماری ئێرلەندا»، بەمە دەست پێدەکات: «بەناوی سالوسی «ثالوث»ی پیرۆز وموقەددەسی گەورەوە، ... کە ئەو سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتێکە دێتە دەست ... وئەبێت ئەو مەرجەعیەتی هەموو کارێکی تاکەکان ودەوڵەتەکان بێت، وئێمەی گەلی ئێرلەندا خۆمان دادەنوێنین خۆمان ملکەچی پەروەرگارمان عیسای مەسیح دەکەین کە بەردێژایی سەردەمەکان باوباپیرانمانی پاراستوە، ودووپاتی هەموو پابەندبوونێکی خۆمان دەکەینەوە لە ئاستی وی...»، هەروەها ئەڵێ:

«هەر سێ دەسەڵاتەکەی وڵات هێزی خۆی لە پەروەدگارەوە وەردەگرێت».



سەبارەت بە ئاڵای ئێرلەندای باکور -کە یەکێکە



---

(١) ئەوەی ئێستا پێی دەوترێ کۆماری ئێرلەندا، وپایتەختەکەی دبلنە، وئەندامی یەکێتی ئەوروپایە، ونیزامی کۆماریە وهەر بە بریتانی (ئینگلیز)یش قسە دەکەن.

لە چووار بەشەکەی بەریتانیا- دووخاچی تێدایە. دروشمەکەشیان زۆر.

## ئاڵاکەی ئوسکوتلەندا

هەروەها با ئاماژەیەکیش بە ئوسکوتلەندا بکەم -کە یەکێکە لە چووار بەشەکەی بەریتانیای گەورە[1]- خاچێك لەسەر ئاڵاکەیەتی، شێوەی



خاچەکەش بۆیە بەوشێوازەیە چوونکە یەکێك لە قەشە گەورەکانیان بەناوی «ئەندرۆ» لە یۆنان لەسەر خاچێکی هاوشێوەی (×) کوژراوە.

## لە ئینگلتەرا ئەبێت فەرمانڕەوا سەر بە کلێسای ئینگلیزی بێت



هەروەها پێویست دەکات ئاماژە بە ئینگلتەراش بکەم -کە گەورەترین بەشی نێو چووار بەشەکەی بەریتانیایە-، لێرەدا ئەبێت دەسەڵاتدار سەر بەکلێسای ئینگلتەرا بێت، ئاینی فەرمی وڵاتیش کلێسای ئینجلیکانیە، خاچێك، تەنها خاچێك ئاڵاکەیەتی!

## لە یۆنان ئاینی فەرمی وڵات کلێسەی ئەرسۆزدۆکسایە

---

(١) هەوڵی جیابوونەوە دەدەن لە بریتانیا ولە ٢٠١٤ لە گشتپرسیەکدا، ٥٥٪ی دەنگدەران بە نەخێر بۆ سەربەخۆیی دەنگیاندا.





یۆنان کە یەکێکە لە ئەنـدامانی یەکێتی ئەوروپا، نیزامی کۆماریـە، دەستور وەسفی ئـاینی فـەرمی وڵات دەکات بەوەی گاورە، وسەر بە کلێسای ئەرسۆزدۆکسا[1] «الأرثوذكسية»ی ڕۆژهەڵاتیە، و«وەمەسیحی پەروەردگار» سەرۆکێتی، ونەریتەکانی کلێیسـای ناوبراو لەم دەوڵەتەدا پیرۆز وموقەددەسە، هەر بە پێی دەسـتور نایاسـاییە سوکایەتی بکرێت بە ئاینی وڵات وتوشی لێپێچـینەوەی یاسـایی دەبێـت. وبەمە دەست پێدەکات: «بەناوی سالوسـی پـیرۆز وموقەددەسـەوە. ئـاڵای وڵاتی یۆنانیش خاچێکی ڕونە، هەر وەکو دەستورەکەیان، هەر وەك دروشـم ولۆگۆکەیان.

## دەستور لە ئیسپانیا: پادشا ئەبێت کاسۆلیکی بێت



ئیسپانیا یەکێکە لە ئەندامانی یەکێتی ئـەوروپا، ونیزامی پادشـایی دەسـتوریە، لێرەشـدا بـە فـەرمی ئـەبێت قوتابیـەکان تەعالیمـەکانی کلێسـای کاسـۆلیکی بخـوێنن لـە




(١) یەکێکە لە سێ کەنیسە سەرەکیەکەی مەسیحیەت، ولـە کەنیسـەی کاسـۆلیکی ڕۆژئاوا جیابووەتەوە، ودان بە دەسەڵاتی پاپاس فاتیکاندا نانێن، لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی شوێنکەوتوانی لە ڕۆژهەڵاتن، بۆیـە پێیـان دەوتـرێ کلێسـای ڕۆژهـەڵات. وئەبنـە دوو کلێسای سەرەکی: کلێسای میسری یان قیبتی، کلێسای قوستەنتینیە.

خوێندنگاکاندا، هەروەها لە دەستوردا لە ماددەی حەوتدا ئـەڵێت: ئـەبێت پاشا لە شوێنکەوتوانی کلێسای کاسۆلیکی بێت. خاچێك لەسەر تاجی نێو ئالآکەیان هەیە، دروشمەکەیان بە هەمان شێوە.

## دەستور لە جۆرجیا : ئاینی فەرمی ئەرسۆزدۆکسایە







جۆرجیــا یەکێکــە لـــە وڵاتــانی ئــەوروپا، بــە پێــی دەستور ئاینی فــەرمی وڵات کلێسەی ئەرسۆزدۆکسایە، وئالآکەی ئەسڵەن بریتیە لـە پێـنج خـاچ، ولـە دروشمەکەشیدا زیاد لە خاچێك هەیە.

## دەستور لە سویسرا : پادشا ئەبێت کاسۆلیکی بێت





سویســرا یەکێکــە لــە وڵاتــانی ئــەوروپا، نیزامــی کۆماریە، دەستورە فیدراڵیەکەی بەمە دەســت پێـدەکات: ((بە ناوی پەروەردگار))، ئەمە سەرباری ئـەوەی ئالآکـەیان

بريتيه له تەنها خاچێك -هەمان ئالآی خاچی سوری نێودەولەتی بە هەڵگەڕاویی[١]-. بە هەمان شێوە دروشمی فەرمی وڵات.

## ئالآی فینلەندا تەنها خاچێکە



کۆماری فینلەندای ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا، ئالآکەیان بریتیە لە خاچێك، لەگەڵ بوونی پەیوەندی توندی نێوان حکومەت وکەنیسە، لەگەڵ باسکردنی یاسای کەنیسە لە دەستوردا.

## لە سوید ئەبێت پاشا سەربە مەزهەبی ئینجیلی بێت



سوید، کە یەکێکە لە ئەندامانی یەکێتی ئەوروپا، ونیزامی پادشاییە، بەپێی دەستور ماددەی چووار: ئەبێت پادشا سەربە مەزهەبی ئینجیلی بێت. ئالآکەشی تەنها بریتیە لە





---

(١) ئەمەش وەکو ڕێزێك بۆ هنری دۆنانی سویسری، کە بە باوکی ڕوحی دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوە دادەنرێت. کە شەڕی سولفرینۆی خوێناوی لە باکوری ئیتالْیا دەبینێت لە نێوان فەرەنسا ونەمسا کە چل هەزار قوربانی لێدەکەوێتەوە، پێشنیاری دامەزراندنی ڕێکخراوێکی مرۆیی دەکات کە بایەخ بە بریندارانی جەنگ بدات. ئیتر کاتێك یەکەم ڕێکەوتننامەی پارێزگاریکردن لە بریندارانی جەنگ مۆر دەکرێت لە ساڵی ١٨٧٤ ئەو ئالآیەی ئێستایان بۆ دانا وناویان لێنا: «اللجنة الدوولية للصليب الأحمر» «لیژنەی خاچی سوری نێودەولەتی» یا «لیژنەی نێودەولەتی خاچی سور».

خاچێك، كە هەتا ساڵی ٢٠٠٠ كەنیسەی فەرمی هەبووە. لەگەڵ بوونی چەندین! خاچ لە دروشمی فەرمی وڵات.

## ئوستراليا

ئاڵای وڵاتی ئوستراليا ودروشمەكەشی خاچی تێدایە.






## كليلى بەهەشت لەسەر ئاڵايانە





فاتیكان یەكێكە لە وڵاتە ئەورووپییەكان كە بچووكترین وڵاتی جیهانە وژمارەیان تەنها هەشتسەد كەسێكە، نیزامی پاپاییە، ئاینی فەرمی وەك دیارە كاسۆلیكیە، خاچێكی زۆر لە ئاڵاكەیان هەیە، دروشمەكەشیان بە هەمان شێوە، **لە هەمووی سەیرتر كلیلی بەهەشتیشی لەسەرە.**

ئەمیش وێنەی پاپای فاتیكان فرەنسیسە -كە دەزانم ئەو دوو بەرێزە وعەلمانیەكانی تریش هەرگیز حەز بەم وێنە ناكەن- لە ناوەڕاستی سەرۆك وڵات وسەرۆك حكومەتە ئەورووپییەكانەوە ڕاوەستاوە لە كڵێسای سیستین لە



فاتیکان[1]، لە بەرواری ٢٥ی ئازاری ٢٠١٧، سەرنجی مــەودای نێــوان پاپــا وسەرۆکەکان بدەن وکەس ڕاســتەوخۆ لــە تەنیشــتیەوە ڕاوەنەوەســتاوە. بــە پێچەوانەی وڵاتە موسڵمانەکانەوە، جا ئەمە ئەو ئەوروپایەیە کــە فەریکــە ڕۆشنبیرەکان ئەڵێن بیٚدینن وئاینیان نیە.

## لە لیختنشتاین ئاینی فەرمی کاسۆلیکیە



وڵاتی «لیختنشتاین» کە یەکێکە لە وڵاتە ئەوروپیەکان وهاوسنورە لەگەڵ سویسرا ونەمسا، ونیزامی ئەمیریە وەك کوەیت، ئاینی فەرمی وڵات کاسۆلیکیە، ولــە نێــو ئــاڵای وڵات ولە دروشــمی فەرمیشدا خاچ هەیە.



## لە ماڵتا ئاینی فەرمی کاسۆلیکیە



کۆمــــاری «ماڵتــــا»، یەکێکــــە لــــە ئەنــــدامانی یــــەکێتی ئــــــەوروپا، وئــــــاینی فــــــەرمی وڵات کاســـۆلیکیە، ولـــە نێـــو ئـــاڵای وڵات ودروشـــمـــــی فــەرمــیشــــدا خاچێــــکی ڕون وتــــەنیا هەیــــە لــــە دەســــتە چەپەوە ئاڵا ودروشمەکە.



(١) دەموچاویان بە ڕونی دیارە تا بزانن فەرمانبەر وشتی کلێساکە نین.

## له مۆناكۆ ئاینی فەرمی كاسۆلیكیه




دەوڵەتی «مۆناكۆ»، یەكێكە لە وڵاتانی ئەوروپا، وهاوسنوری فەرەنسایە، ئاینی فەرمی وڵات كاسۆلیكیە، وله نێودروشمی فەرمیشدا خاچ هەیە.

## له هۆڵەندا دروشمی فەرمی زیاد له خاچێكی تێدایه




هۆڵەندا یەكێكە لە ئەندامانی یەكێتی ئەوروپا، نیزامی پادشایی دەستوریە، لە نێو دروشمی وڵاتدا خاچ هەیە.

## له ئەرمینیا ئاینی فەرمی كلێسەی ئەرمەنی ئەرسۆزدۆكسایه



وڵاتی ئەرمینیا كە یەكێكە لە وڵاتانی ئەوروپا، نیزامی كۆماریە، ئەڵێن: كۆنترین وڵاتە مەسیحیەتی كردبێتە ئاینی فەرمی، ئاینی فەرمی ئێستا تێیدا كلێسەی ئەرمەنی ئەرسۆزدۆكسا «الأرثوذكسية»یە.



هەروەها لە دروشمی ئەو وڵاتەدا جگە لە بوونی خاچ، كەشتیەكەی نوحیشی! تێدایە لەسەر شاخی ئارارات.

## لە بوولگاریا ئاینی فەرمی مەسیحیەتی ئەرسۆزدۆکسایە

بوولغاریا یەکێکە لە وڵاتانی ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا، وپایتەختەکەی سۆفیایە ونیزامی کۆماریە، لە ماددەی سێی دەستووردا ئەڵێ: مەسیحیەتی ئەرسۆزدۆکسای شەرقی، بە دینی تەقلیدی دادەنرێت لە کۆماری بوولگاریا. کە ئەمەش تایبەتمەندی پێدان وبەرزکردنەوەی ئەو ئاینەیە بەسەر ئەوانی تردا.



هەروەها لە دروشمی فەرمی وڵاتی بوولغاریادا خاچ هەیە.

## دروشمی چەکی دەریایی ئیتاڵیا خاچی لەسەرە



ئیتاڵیای عەلمانی ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا، کە نیزامی کۆماریە، لە دروشمەکەشیدا چۆن هێماکردنی بۆ عەلمانیەت لەبیر نەچووە(١)، بەڵام لەبیریشی نەچووە، چەکەکان بە هێزی خوا دەتەقن، بۆیە لە دروشمی چەکی دەریایی ئیتاڵیا خاچێکی داناوە، دوو خاچ، بەڵکو سێ.

## دروشمی بەلجیکا دوو خاچی تێدایە





بەلجیکای ئەندام لەیەکێتی ئەورووپا، کە نیزامی پادشایی دەستوریە، لە دروشمەکەیدا سدوو خاچی

(١) وەك لە دروشمەکانی پێشتریدا هەمیشە هێمای بۆ خاچ دەکرد.

داناوە، بە دانەیەك تێری نەخواردووە.

## دروشمی لۆکسمبۆرگ دوو خاچی تێدایە




ئـــەمیش بەدانەیـــەك نـــەیوتوە بەســـە تـــا کردوویـــەتی بـــە دووان، بـــەڵکو هـــی تریشـــی تێدایە.

## ئاڵای سلۆڤاکیا خاچی تێدایە




ســـلۆڤاکیای ئەنـــدام لـــە یـــەکێتی ئەوروپا، دوو خاچی تێکەڵی تێدایە، وەکو هێمایـــەك بـــۆ هـــەردوو قەشـــە: «کیرلّـــس» و«میپۆدیوس» کە شەفاعەتکاریانن تا خوا لـە لـە تـاوانی ئـەمان خـۆش ببێ، ئەمانیش وەکو وەفایەك هەردوو خاچەکەیان لەســـەر ئـاڵاکـــە دانـا، هەروەها لەسەر دروشمەکەشیان.

## دروشمی وڵاتی لیتوانیا خاچێکی لەسەرە



لیتوانیای ئەندام لە یەکێتی ئـەوروپا، گـەورەترینی نێـو هەموو وڵاتەکانی ئەورووپای بـاکورە، خاچـێکی زەق لەســەر قەڵغانێکی ڕەق دانراوە.

## دروشمی هەنگاریا «مەجەڕ» دوو خاچ زیاتری لەسەرە



ولاتی هەنگاریا یا مەجەڕ کە دەوکەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپاوە، لە نێو دروشم ولۆگۆکەیان بە خاچ دەوری خۆیان داوە.

هەروەها سەرۆك وەزیرانی مەجەر بەناوی ئۆربان -وەك لە ڕۆژنامەی گاردیاندا هاتوە- لە ٣ی سێپتەمبەری ٢٠١٥ ئەڵێ: ئەوروپا وئەورپییەکان مەسیحین وکۆچبەرەکانیش دێن موسڵمانن، بۆیە بۆ ئەوەی شوناسمان نەگۆڕێت ئەبێت ڕێگری لە هاتنیان بکەین[1].

## دروشمی ڕۆمانیا سێ خاچی تێدایە



ڕۆمانیای ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا، کە پایتەختەکەی بووخارستە، سێ خاچ لە دروشمەکەیدایە.

## لە مۆنتینیگرۆ لە ئاڵا ولە دروشمدا زیاد لە خاچێك هەیە





لە ولاتی «الجبل الأسود-شاخی ڕەش»ی باشوری ئەوروپا، کە خەریکی بە ئەندامبوونە لە یەکێتی ئەوروپا، لە ئالاکەیاندا سێ خاچ هەیە، هەروەها لە دروشمەکەشیاندا. دەشبینی دروشمەکەیان پێك هاتوە

(١) سەرچاوە:
www.theguardian.com/world/٢٠١٥/sep/٠٣/migration-crisis-hungary-pm-victor-orban-europe-response-madness

له دالێکی دووسەر، کە ئەوە هێمایە بۆ یەکیەتی کلێسا ودەوڵەت!

## له سڕبیا له ئاڵا وردووشمەکەیان خاچ هەیە.



کۆماری سڕبیا کە خەریکی بە ئەندامبوونە لە یەکێتی ئەوروپا، لە ئاڵا ودروشمەکەیاندا چەندین خاچ هەیە. وقەڵغانێکی تێدایە بریتییە لە قەڵغانەکەی قەشە جۆرج.





## مۆڵداڤیا له ودروشمەکەیدا





## ئاڵا خاچ هەیە

ئەم دەوڵەتە ئەوروپییە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتیەوە، دراوسێی ئۆکرانیایە، لە ئاڵا وخاچەکەشیاندا داڵێکی لەسەرە وخاچێکی بە دەمەوە گرتوە.

## دروشمی وڵاتی ڕوسیا چووار خاچی تێدایە



ڕوسیا: ئەم وڵاتە ئەوروپییە دروشمەکەی چووار خاچی تێدایە، سێ خاچ لەسەر هەر سێ تاجەکە، وخاچێکیش بە دەستی بازەکەوەیە.



## ئاڵا ودروشمی سان مارینۆ خاچی تێدایە







سان مـــارینۆ: ئــەم وڵاتــە ئەورووپیــە، کــە دراوسێی ئیتاڵیایە، لە ئاڵا ودروشمەکەیانــدا خاچ هەیە.

## کەنەدا لەسەر بنەمای بە گەورە ڕاگرتنی خوا دامەزراوە





لە دەستوری کەنەدادا ئەڵێ: «کەنــەدا دامــەزراوە لەســەر مەبدەء «پرەنسیپ»گەلێك ڕەچاوی گــەورەیی خــوا وحوکمی یاسا دەکا». وخاچ لەسەر دروشمەکەیەتی.

## زۆری خاچی سەر ئاڵاکان سەری لە خۆشیان تێکداوە

جا ئێستا هەقی خۆتانە بپرسن: باشە ئەم هەمووخاچە چیە؟ بۆچی هەموویان خاچێکیان داناوە!؟ نەترساون ئاڵاکانیان تێکەڵ بێت؟! بێگومان پرسیارێکە جێی خۆیەتی.

جا با قسەیەکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە: لە بــەرواری ١٤,٤,٢٠١٤ لــە مەراســیمی پێشــوازی کــردن لــە ســەرۆکی سویســرا لەلایــەن ســەرۆکی حکومەتی ئۆکرانیاوە، لــەبری دانــانی ئــاڵای سویســرا، ئــاڵای دانیمــارك



دانرابوو، کە سەرۆکی سویسرا ئاڵاکە دەبـینێ سـەیری لێـدێت[1]. ئەوەنـدە ئاڵاکانیـــان لەیـــەك چـــووە، جەماعـــەتی پرۆتۆکـــۆڵ لێیـــان تێکچـــووە، ناهەقیانە؟[2].

## «پابەندە بە ئـازادی بەگوێرەی دیدگای پەیامبەرانی گەلی ئیسرائیل»

لە دەستوری ئیسرائیلدا هاتوە: «ئیسرائیل دەوڵەتێکی دیموکراتیە، ڕاوەستاوە لـەسەر مەبـدەئەکانی ئـازادی وعـەدالەت وئاشتی بە گوێرەی دیدگای پەیامبەرانی گەلی ئیسرائیل...».

هەروەها کە تەماشی ئاڵا ودروشمـی ئیسـرائیل دەکـەیت، هـەردووکی دینیە -بەڵکو ئیسرائیل هەر خۆی دەوڵەتێکی دینیە-؛ ئاڵاکـە نەجمەکـەی پەیامبەر دووادی[3] تێدایە، هەروەها دروشمەکەش مۆمـدانێکی[4] تێدایـە، ئەمەش هێمایە بۆ ئەو مۆمدانەی نزیکەی سێ هەزار! سـاڵ پـێش پێستا






(١) یان: عەجایبی لێهات، بەڵام ماوەیەکـە «شـۆك-Shock»ی ئینگلیـزی جێگـەی گرتۆتەوە! بەداخەوە. **لە کاتێکدا شۆك لە زمانی کوردیدا بە گەزۆی مازو دەوترێـت، بە دۆشاویش دەوترێت، هەروەها بە دەردێکیش دەیلێن دەدا لە درەخت وگەڵا مێو.**

(٢) سەرچاوە: کەناڵ وسایتی فەرمی: «روسیا الیوم».

(٣) ئەوەی پێی دەوترێ خاتەمەکەی سولەیمان

(٤) شەمعەدانیشی پێ دەوترێ، بریتیە لەو شتەی مۆمی لەسەر دادەنرێت.

هەیکەل سولەیمان «ماڵی پیرۆز»ی[1] پێ ڕوناك کراوەتەوە. هەروەها کار بە ڕۆژمێری عیبری (یەهودی) دەکرێت.

## لە پۆڵەندا کڵێسای ڕۆمانی کاسۆلیکی تایبەتمەندکراوە

لە وڵاتی پۆڵەندا «پۆلۆنیا» دیسانەوە لە دەستوردا تایبەتمەندی دراوە بە کڵێسای ڕۆمانی کاسۆلیکی، وەکو لە ماددەی ٢٥ دا هاتوە.

هەروەها تێیدا هاتوە ئەڵێ: «ئێمەی گەلی پۆڵەند ... بە هەموو هاوڵاتیانی ئەم کۆمارەوە ... چ ئەوانەی بڕوایان بەوەیە پەروەردگار سەرچاوەی هەق ودادگەری وخێر وجوانیە، یان ئەوانەی ئەم بڕوایەیان نیە بەڵام ڕێز لەم بەها کەونیانە دەگرن وبڕوایان پێیەتی بەڵام لە سەرچاوەی ترەوە ... جا وەکو دەستگرتنێك بە ڕەگ وڕیشەی سەقافەتەکەمان کە لە توراسی مەسیحیەتەوە سەرچاوەی گرتوە ... ووەکو هەستکردن بە بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر بە پەروەردگار وبەرامبەر بە ویژدانمان دەستورەکەمان دەنوسینەوە».

جا وەك بینیت یەکێتی ئەوروپا لە کۆی بیست وهەشت وڵات، تەنها وڵاتی ئەڵمانیا وفەرەنسا وکۆماری ئێرلەندا وپورتوگال ونەمسا وئیستۆنیا

(١) واتە پەرستگا «شوێنی عیبادەت»ی نەبی سولەیمان، وهەیکەل بە عیبری واتا: ماڵی خودا «بيت الإله»، وئەم هەیکەلە لای یەهودەکان زۆر پیرۆزە، شوێنەکەشی هەمان ئەو شوێنەیە کە مزگەوتی ئەقسا و«قبة الصخرة»ی تێدایە.

وپۆڵەندا وچیك وسلۆڤینیا وقوبرس ولاتڤیا وکرواتیا، نەبێت هیچ کامیان بێخاچ نەبوون، واتە: تەنها یازدە وڵات نەبێت، ئەویش هەندێکیان وەك پۆڵەندا وئێرلەندا لە شتی تردا هەقیان کردۆتەوە.

## کۆستاریکا

**وڵاتی کۆستاریکا**، بەپێی دەستوری ساڵی ١٩٤٩، هەمووارکراو لە ٢٠١١ دا: ئاینی فەرمی تێیدا ڕۆمانی وکاسۆلیکی ڕەسولیە. هەروەها **وڵاتی باراگواییش**.

## سلڤادۆر

* هەروەها **وڵاتی سلڤادۆر**: دروشمی فەرمی بریتیە لە: «پەروەردگار، یەکێتی، ئازادی»، هەوەها ناوی دەوڵەتەکەش «El Salvador» واتە: ڕزگارکەر «یەسوع - عیسا» بە زمانی ئیسپانی.

## ئەرجەنتین

**وڵاتی ئەرجەنتین**: لە دەستوری ساڵی ١٩٨٣، هەمووارکراو لە ١٩٩٤ دا، ماددەی دوو ئەڵێ: پێویستە حکومەتی ئیتیحادی پشتگیری کڵێسای ڕۆمانی کاسۆلیکی ڕەسولی بکات.

هەروەها لەو وڵاتانەی تر کە تایبەتمەندیان داوە بە ئاینێکی تایبەت لە ئاینزا مەسیحیەکان: ئەندۆرای هاوسێی فەرەنسا، وئەرجەنتین، وئیتاڵیا،

ودۆمنیکان، وسلفادۆر، وپورتوگال، وپەنەما، هەروەها پـیرۆ کـە تەنانـەت بـەپێی یاسـا خوێنـدنی ئـاینی ئیلزامیـە وتـەنها کاسـۆلیکیش بـە وانـە دەدرێتەوە.

ئەمە وەکو ولاتان، خراپ نیە دوو نمونەش -هی تـریش زۆرن- بهێنمـە بە دروشمی بـەناوبانگترین دوو یانـەی تـۆپی پێـی جیهـان: ڕیـال مەدریـد وبەرشەلۆنە، بە تەرتیبی حروفی ئەبجەدی باسیان لێوە دەکەم:

## یانەی بەرشەلۆنە

یانەی بەرشەلۆنە تا ئێستا دە جار گۆڕانکاری بەسـەر دروشـم «لۆگـۆ» کەیدا هاتوە، لە هیچ کامیان دەستکاری ئەو خاچە نەکراوە کە تێیدایە.




## یانەی ڕیالْ مەدریدیش خاچ لە دروشمەکەیدا هەیە

یانەی ڕیالْ مەدریدیش بە هەمان شێوە[1].

(١) کەناڵی ڕوسیا ئەلیەوم وسکای نیوز لە ٢٥,٠١,٢٠١٧ بلاویان کردەوە کە یانـەی ڕیالْ مەدریدی ئیسپانی گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیای مارکەی ئیماراتیدا گرێداوە بـۆ شەش ولاتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە دروشم (لۆگـۆ)ی ڕیـال مەدریـد بـەبێ خاچـەکە بلاوبکاتەوە، لە قەمیس وپێلاو وبەرگی مەلەکردن، کۆمپانیاکەش ئەڵێ: لەبەر هەسـتی




جا دووای ئەم گەشتە ئەڵێم: کەواتە ئیتر بۆ دەتانەوێت ئەو خەڵکە بێدین بکەن؟! ئەوە ماشاء الله ئەوروپا ئەوەندە دیندارن! ئێوە نالێن باش وێنیان بکەوین؟ فەرمو با شوێنیان بکەوین!

## ئەمریکا وجۆرج بۆش

کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی -ئەو کاتە بەس هاوڵاتی بوو- وتەیەکی جۆرج بۆشم تێدا خوێندەوە کە ئەو شەڕەی لە عێراق وئەفغانستان دەیکات عیسا پێی وتوە یان شتێکی نزیك لەوە.

بەڵام چوونکە هاوڵاتیم دەست نەکەوت وژمارەکەیشم نەزانی، توانیم سەرچاوەی وتەیەکی تری هاوواتام دەست بکەوێت لە بی بی سی وگاردیانی بریتانی کە ئەڵێ: لەسەر کارێکم خوا ڕای سپاردووم ... وشەڕێکی خواییە ... خوا پشتیوانیم دەکات لەم شەڕانەی دەیکەم لە عێراق وئەفغانستان ... خوا پێم دەڵێ ئیسرائیل بپارێزم. هەر لەو

---

موسڵمانان خاچەکە لەسەر تاجەکە لابراوە. شایانی باسە لە ساڵی ٢٠١٤ هەمان شت دووبارە بوویەوە. هەروەها «ئێم بی سی» یش بڵاوی کردەوە -خۆی ئاسا نا- بەڵکو زۆر شەرمنانە نوسیویەتی بەهۆی هەستیاری سەقافەتەوە لابراوە!

ڕاپۆرتەدا ئەڵێ: پێش شەڕی عێراق کاتێك کۆبوونەتەوە بۆ بڕیاردان لەسەر شەڕەکە، لەگەڵ تۆنی بلێردا لە کەنیسەیەکی تەکساس بینراون بۆ نوێژکردن وپاڕانەوە لە خوا بۆ ئەڵگیرساندنی ئەو شەڕە[1].

هەروەها جۆرج بۆش یەکێکە لەو سەرۆکانەی ڕۆژانە ئەبێت ئینجیل بخوێنێتەوە، وهەروەها ئەڵێ: عیسا ژیان ودڵی گۆڕیوم[2].

## ئەنجێلا مێرگلی «فریشتە!» ومەسیحیەت

لە بەرواری ٢ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٦ لە لێدووانێکیدا لە کۆنگرەیەکی حیزبی، لە شاری فیتینبوورگی باکوری ئەڵمانیا داوای گەڕانەوەی بەها مەسیحیەکانی کرد، ووتی: با تەرکیز نەخەینە سەر ترسان لە موسڵمانان، وجەختیشی کردەوە کە حیزبەکەی (پارتی دیموکراتی مەسیحی) هەمیشە نوێنەرایەتی مەسیحیەت دەکات. هەروەها وتی: بەڵێ: دڵەڕاوکێ ومەترسی هەیە لە ئیسلام، بەڵام ئێمە ئەو حیزبەین کە وشەی مەسیحیەت لە ناوەکەیدا هەیە، ئایا ئێمە هەستمان بە خۆمان کردووە وئاگامان لە خۆمانە؟![3].

---

(١) ئەمەش دەقەکەی لە ڕۆژنامەی گاردیان:
www.theguardian.com/world/2005/oct/07/iraq.usa

(٢) ئەمەش دەقەکەی لە ئێن بی سی نیوز:
www.nbcnews.com/id/6014570/ns/us_news-washington_post/t/bush-leaves-specifics-his-faith-speculation/#.WVv05IjyvIU

(٣) سەرچاوە: سایت ئەلجەزیرە.

خوێنەری هێژا: ئەزانن نـاوی پـارتی دەسـەڵاتداری ئێسـتای ئـەڵمانیا چیە؟ ئەوەی کە ئـەنجێلا مێرگـل سـەرۆکێتی؟ نـاوی: «پـارتی مەسـیحی دیموکراتە»، یا «پارتی دیموکراتی مەسیحی!».

باشە ئەگەر وڵاتـە موسـڵمانەکان لـە ئاڵاکانیـان بنوسـن: «لا إله إلا الله»، ئەبێت ئـەم عەلمانیانـە چـی بکـەن؟ چـەند تۆمـەتی دوواکـەوتویی وکۆنەپەرستی بدەنە پاڵ کۆمەڵگای موسڵمانان؟

یان حیزبێکی عەلمانی پاشگری ئیسلامی بۆ خۆی زیـاد بکـات، ئـەوە ئەسڵەن ئەبێتە خۆشترین نوکتـەی سـاڵ؛ بـەخۆی ئـەڵێ: عەلمانیـە کەچـی پاشگری ئیسلامیشی بۆ خۆی زیاد کردووە؟![1] ئەمە جگە لـەوەی ئەگـەر تەماشای پشوە فەرمیـەکانی زۆربـەی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا بکـەی، دەبـینی زۆربەی -نەك زۆرێکی- یان دینیە یان پەیوەستیەکی هەیە بە دینەوە.

لە کۆتاییدا با داوا بکرێت ئەو ماددەیەش بهێڵرێتەوە یان بنوسـرێتەوە: ئەبێت سەرۆکی وڵات موسڵمانێکی سوننی مەزهەب بێـت، بـا لەمەشـدا چاویان لێبکرێت. مەگەر ئەوان پێشکەوتونین؟!!

ئەگەر چی ئەوان زۆر لەوە وردتریشـیان کردۆتـەوە، بۆنمونـە: سـەرۆکی وڵات ئەبێت گاورێکی ئینجلیکانی پرۆتستانتی لۆسەری بێت، وەکو ئەوایە بڵێ: ئیسلامێکی سوننی مەزهەبی شافیعی بێت بە تێگەیشتنی نەوەوی!

---

(١) کەواتە ئەوە خۆیانن عەلمانیەتیان بە ئیلحاد گەیاندۆتە خەڵك.

# بەزۆر وایە یان بە بەڵگە؟!

ئەڵێ: **«تەجروبەی مێژوسەلماندوویەتی کە دەوڵەت ئاینێکی هەبێت، دەستدەکات بە ستەمکاری»**.

ئاخر بەڕێزان ئەمە هەر بە زۆر وایە یان بە بەڵگە؟ ئەگەر بە بەڵگە وایە، کوا ؟! کامیان بەهۆی ئەوەی دەوڵەتەکەی ئیسلامیە ستەمی کردووە ؟! بەهۆی ئیسلامەکەوە ئەڵێم، نەك هەر خۆی ستەمکار بوو بێت وپاوانخوازی ودەستدرێژی کردبێت. وەکو چۆن هەیە دەوڵەتەکەی عەلمانیە یان شیوعیە، ستەمیش دەکات، جا تۆ ڕازیت بەوە بووترێ عالمانیەت ستەم دەکات؟ یان ئەڵێی: عەلمانیەتی خراپ بەکار هێناوە؟

شیوعیەکان ڕازین بەهۆی حوکمەکەی کۆریای باکورەوە یان ستەمەکانی وڵاتی چینەوە لە حەفتاکان کە «٣٠,٠٠٠,٠٠٠» سی ملیۆن خەڵك لە برسا مردن، ئەوان تاوانبار بکرێن وبووترێت خەتای شیوعیەتە ؟! ڕازی دەبن؟ بەڵکو لەو کاتەی «ماو» خەڵکی دەکوشت لە چین وملیۆنان لە برسا مردن کتێبەکانی لێرەدا لەگەڵ ئەلیف وبا بە خەڵك دەدرا ! بەڵکو خۆی ئیعتراف دەکات کە لە ساڵی ١٩٥١ بە مەبەستی کپکردنەوەی شۆڕشە بەرهەڵستکاریەکەی دژی نزیکەی ٨٠٠,٠٠٠ لەوانەی دژی سیاسەتەکەی بوون لەناو بردووە، هەروەها شانازی دەکات کە ٤٦,٠٠٠ زانای بە زیندوویەتی لە گۆڕناوە!

پاشان ئەمە دژی واقیعە، ئەو هەموو وڵاتەی مـن ڕێـزم کـرد دیـنی فەرمی هەیە، هەر خۆتیش پێت وایە ستەم ناکـەن ومـەدەنین ودیموکراتین، کەواتە دەرکەوت ئەم قسە نە بۆ ئێستا ڕاستە نە بۆ مێژوو!!

**دووای ئەوە:** ئەگەر نمونەی خراپ لە دەوڵەتێکی بـەناو دینیـەوە بینـرا بێت، خراپتر لە دەوڵە عەلمانیەکانەوە بینراوە. ئەو دەوڵـە عەلمانیانـەی تـۆ شانازیان پێوە دەکەیت ساڵەهای ساڵ خەریکی ئیستعمار وکوشـتن وبڕینـی ملیۆنەها خەڵك بوون!

پاشان: باشە ئەی هەموو ئەوانەی ئاینێکی دیاریکراویان نەبووە ونیانـە وستەمیان کردووە ودەیکەن چۆن؟! بە دیدی تۆ؟ ئەو سـتەمەی ئێسـتا لـە کۆریای باکور هەیە زەحمـەت نـەبێ، ئـاینی فـەرمی وڵات چـیە؟ کـە تـۆ شیوعیەت وعەلمانیەت بە ئاین نازانیت!

کەواتە کێشەکە لە ئایین نیە!؟

پاشان: تکایـە قسـە لـە مێـژو مەکـە کـە زانسـتێکی قـوڵ وفـراوان وپێویستی بە پسپۆری یان خوێندنەوە وشارەزایی زۆر هەیە، چـوونکە: «من تکلم في غير فنه أتى بالعجائب».

ئینجا: ئەوە تۆمەتبارکردنی هەموو پەیامبەرانی خوا نیـە، ئەوانـەیان کە دەسەڵاتیان بە دەستگرتوە لە مێـژودا وەکـو داود وسـولەیمان ودەیـەها پەیامبەری تر ﷺ لە کوڕەکانی یەعقوب ﷺ، هەروەها پەیامبەری خـوا

موحەممەد ﷺ. هەروەها چووار خەلیفەکەی پەیامبەریش. بێگومان ئێمە -پشتیوان بەخوا- دەزانین عەلمانیەکان چی دەڵێن وچیان مەبەستە، بەڵام بۆ چەواشەی خەڵك دەكەن وناوێرن بە ڕاشكاوانە مەبەستەكانتان بڵێن؟!

## سوکایەتیکردنێکی زۆر بە کۆمەڵگای کوردی

خاڵێکی تر لە بەرنامەکە بریتیە لە: سوکایەتکیردنێکی زۆر بە کۆمەڵگەی کوردی ومێژو وکلتورەکەی.

هەڵبەت ئەگەر بە وردی چەند جارێك گوێ لە بەرنامەکە بگری، هەست دەكەیت ئەو دوو ڕۆشنفیکرە! بەڕێزە، ئەیانەوێ بڵێن کەس هۆشیار نیە من وئەم م.هاوژینە نەبێت لەگەڵ هاوبیرانمان! گوێبگرن بزان چەند جار ئەڵێن: کۆمەڵگای ئێمە حاڵی نەبووە!؟ بزانن چەند جار ئەڵێ: کۆمەڵگایەکی بێ ئاگا وبێ خەبەرە؟! هەروەها ئەڵێن: بێگومان کۆمەڵگا هۆشیاری لە ئاستی پێویستدا نیە! هەروەها ئەڵێن: ئێمە لە دەرەوەی رێنیسانسین ئەمانەوێ بڕۆینە ناو ڕینیسانسەوە، هەروەها بە سوك ڕوانین لە حوجرە، هەروەها ئەڵێ: دەرکەوت لەسەر بیابانێکی بەرەهوتین. وئەڵێ: کەلاوەیەکە، وئەڵێ: تازە پێمان ناوەتە نێو نوسینەوە، ئەسڵەن ئەوە نوسین نیە... هتد.

هەروەها گاڵتەکردنێکی زۆر بە عابا وخۆ پێچانەوە وشوبهاندنی بە خێو ودێو، کە ئەمە ئەوپەڕی بەدئەدەبیە لەئاست دایك وداپیری خۆ، کە ساڵەهای ساڵ عابایان بەسەرەوە بووە وخۆیان پێچاوەتەوە.

هەروەها لە بەرنامەکە دەتبینی گاڵتەیەکی زۆر دەکرا بە قیەمە ئیسلامیەکان، تەنانەت ئەڵێ: ((ئەمە قیەمە ئەمانەوێ بیهێنین؟!)).

## عەیب نیە گرتوتە بە مێگەل وڕەشەوڵاخ وگا وگاڕان وئەو شتانەوە

ئەڵێ: ((کۆمەڵگای کوردی گاڕان نیە (تا ٩٣٪ موسڵمان بێت))).

بەڕێز د.فاروق! دەوێری بڵێی فاتیکان گاڕانە!؟ ئەی ڤەنزوێلا؟ ئەی یۆنان؟ ئەی دەیان وڵاتی تر کە ڕێژەی گاورەکان تێیدا لە ٩٠٪ ەوە[1] دەست پێدەکات تا ١٠٠٪. لە ئایینەکانی تریش هەورەها. یانی هەر ڕۆژێ خوا نەکردان! لە کوردستان، عەلمانیەکان تێیدا لە کەمینەوە بوون بە زۆرینە و٩٣٪ یان پێکهێنا ئەوسا کۆمەڵگەی کوردی گاڕان ومێگەلە، یان چی؟!

پاشان عەیب نیە گرتوتە بە مێگەل وڕەشەوڵاخ وگا وگاڕان وئەو شتانەوە کە ئەوانەی دابوونەریتی قسەکردن لە باوباپیرانیانەوە فێر بووبێتن شەرم دەیانگرێت گوێ لە شتی وا بگرن.

---

(١) وەك لۆکسمبوورگ وسان مارینو.

## سەلماندنی ئەوەی عەلمانیەت لەناوبەری بەها باڵاکانە

هەروەها ئەڵێ: «**کە یاسـایەکت دانـا وتـت شـەریعەت سەرچـاوەی سەرەکیە بۆ یاسادانان ئەوا تۆ ڕێت لە من گرت پێ بنێمە نێودوونیـای ئازاد وپێ بنێمە نێودوونیای مۆدێرنەوە** ...». وئـەڵێ: «**بـوونی ئـەو دوو ماددەیە (یانی: ماددەی شەش وماددەی مافەکانی مرۆڤ) واتـا ئیفلـیج بـوون، واتـە: تـۆ نـاتوانی ولات بەڕێوەبـەری ... کۆمـەڵێ ئـەحکامی شـەرعی هەیـە پێچـەوانەی هـەموو مافـەکان وبـەها وپرەنسـیپە گەردوونیەکانە کە ئەمڕۆ بەشەریەت خـەباتیان بـۆ دەکـات وباوەڕیـان پێدەکات ولەسەری دەوڵەت دادەمەزرێنێت**».

**قوربان!** سەرەتا ئەمە دیدی تۆیـە بـۆ ئیسـلام، کـە لـەو تێگەیشـتنە سەقەتەوە دروست بووە کە بۆ ئیسلام هەتە.

**هـــەروەها** ئەمـــە ســـوکایەتی ودژایەتیـــەکی گـــەورەی خـــوا وئیسلامەکەیەتی، کە ئەگەر ئەوەی تۆ دژە ئیسلام نەبێت واللە لەسەر ئـەم ئەرزە هیچ دژە ئیسلام نیە!!

**هەروەها** دەرکەوت ئێوە باسی ئیسلامی سیاسی ناکـەن بـەڵکو باسـی خودی ئیسلام دەکەن، ڕقیشتان لە ئیسلامی سیاسی هەڵنەساوە بەڵکو لـە ئیسلام ڕقتان هەڵساوە.

یانی من به تۆ بڵێم: بیروبۆچوونەکانت پێچەوانەی هەموو مافەکان وبەها وپرەنسیپە گەردوونیەکانە وکۆمەڵێکی بەربەریە -وەك تۆ بە ئیسلام ئەیڵێی- ئەمە یانی چی؟ یانی تۆ خەڵکی بیابانی نەك شارستان.

هەروەها وا قسە دەکەیت کە ئەم گەردوونە هەمووی عەلمانیە لە کاتێکدا وا نیە، تەنها کۆمەڵە وڵاتێکن عەلمانیەتیان لە دەستور چەسپاندووە.

هەروەها ئەو ماف وبەها وپرەنسیپە گەردوونیانە کامەنەن کە ئیسلام دژیەتی؟ مارەکردنی ژن لە ژن یان پیاو لە پیاو؟ یان هاوسەرگیری لەگەڵ ئاژەڵان؟ یان داڕوخاندنی خێزانەکان؟! یا سو، کە خواردی سەری وڵاتە عەلمانیەکان؟! یا داوێن پیسیەکان، کە ملیۆنانن لە وڵاتە سیکۆلارەکان، کە ڕۆژانە بەهۆی ئایدزەوە دەمرن چوار کەسیان؟! کام ماف وبەها وپرەنسیپی گەردوون وژیان؟!

یان پرەنسیپەکان بریتین لە کوشتن وبڕینەکان، کە ئەنجامدەدرێت لە وڵاتە عەلمانیەکان، هەیە دەرهەق بە موسڵمانەکان؟!

یان ئەو بەهایانە بریتیە لە خنکاندن وپەستان خستنە سەر موسڵمانان، لە وڵاتەکانتان، کە زۆر جار هەموو تاوانێکی ئەوەیە خـوا خولقاندوویـەتی بە موسڵمان[1].

خۆ ئەگەر ئەوماف وپرەنسیپانە بریتین لە شتی چاك، ئەوە ئیسـلام بـۆ شتی چاك هاتوە وبووهتانە بووترێ ئیسلام دژی بەها باڵاکانە.

ئەگەریش بەها باڵاکان ئەوانەن باسکرا ئەوە لای ئێمە شـتی بـێ نـرخ وبێ بەهان!!

هەروەها ئەم قسە پێچـەوانەکەی ڕاسـتە ئـەوە عەلمانیەتـە شـتی وای تێدایە کە پێچەوانەی هەموو ماف وبەهاو پرەنسیپە گەردوونیەکانە.

---

(١) ڕۆژنامەی بەناوبانگی جیهـانی: «ئیندبنـدنت - independent»ی بریتـانی لیبڕالی، ڕاپۆرتێکی بڵاوکردۆتەوە -کە هەرگیز ڕاپۆرتی وا لە کەناڵـەکان وڕۆژنامـەکانی ئەملاتر نابینی-، ڕەخنەی ئەوە دەگرێت لە کەناڵە جیهانیەکان کە بە هێرشکردنە سـەر موسڵمانان ناڵێن ئیرهاب، بەڵام ئەوان هێرش بکەن پێی دەوترێ ئیرهاب، هەروەها باسی ئەوە دەکات ساڵانە حەوت هەزار! هێرشی ڕقاوی دەکرێتـە سـەر موسـڵمانان تـەنها لـە بریتانیا، لە نێوان ئازاری «٢٠١٦» بۆ ئازاری «٢٠١٧»، «١٤٣٩٢٠» سـەد وچـل وسـێ هەزار ونۆسەد وبیست پۆست (جریوە) کراوە لە تویتەر لە دژی موسڵمانان وئیسلام، کـە دەکاتە ٣٩٣ بڵاوکراوە لە ڕۆژێکدا!!

هـەروەها دووانـزە سـەعات پـێش ئێسـتا «٠٣,٠٧,٢٠١٧» هـەر «ئیندبنـدنت»ی بریتانی، لە ڕاپۆرتێکیدا ئەڵێ: ئەگەر هێرش بـۆ سـەرکراوەکە (قوربانیەکـە) موسـڵمان نەبێت، پێـنج ئەوەنـدەی موسـڵمانەکە زیـاتر ڕاگەیاندنـەکان باسـی دەکـەن وگـەورەی دەکەنەوە. سەرچاوە: سایتی «ئیندبندنت».

ئایا ئەوروپا وئەمریکا وولاّتانی تر ئەوانەی بوون بـە عــەلمانی دەیــەها پرەنسیپ وبەهای بالاّیان لە دەست نەچوو؟! دوو عاقــلْ خیلافیــان لەمــەدا هەیە؟! ئەو بیْ ڕەوشتیەی لە دوونیای عەلمانیەتدا هەیە ئەزانی چەند زیانی لیّداون؟ تیّکچوونی شــیرازەی خیّــزان، کــە بەختــەوەری لــەژیان بەنــدە بــە خیّزانداری وخزم وسەردانەوە؟ ئیّستا کوا؟ إلا ما رحم ربك!

کچیّکی تەمەن حەڤدە سالْ بیّنە لە ولاّتــە عەلمانیەکانــدا بــە کچــیّتی مابیّت؟ زۆر بە کەمی! عەلمانیەت نەیهیّشتوە.

لە ولاّتە عــەلمانیەکاندا سالاّنە نزیکەی ٤٠٠٠٠٠٠٠ چل ملیــۆن منــدالْ لەبار دەبریّن، وتەنها لــە ٢٠٠٣، ٤١٦٠٠٠٠٠ ملیــۆن حالّــەتی لــەباربردن هەبووە. بەڵکو لە ٢٠٠٨، ٤٣,٨٠٠,٠٠٠ ملیۆن حالّەتی لەباربردن هەبووە، بەڵکو لە بی بی سی ئەڵیْ ٥٦,٠٠٠,٠٠٠ پــەنجا وشــەش ملیــۆن. وســەدان هەزاری ئەمانە بەهۆی ئەوەیــە کچــە! حــەفتا هــەزاری ئەمانــە دایکەکــە بەهۆیەوە ئەمریّت! نزیکەی نیوەی ئەم دووگیانانە لە تەمەنی موراهەقین!

لە ولاّتە عــەلمانیەکاندا لەیەك ولاّتیانــدا نزیکــەی نیــوەی خیّزانــدارەکان پەیوەندی تریان لە دەرەوەی خیّزان هەیە!

لــە ولاّتــە عەلمانیەکانــدا نزیکــەی نیــوەی خیّزانــدارەکان خیانــەت لــە ژنەکانیان دەکەن وژنەکانیش بەهەمان شیّوە!

له ولآته عه‌لمانیه‌کاندا له‌یه‌ك ولآتیاندا وه‌ك ئـه‌مریکا ١٠٠٠٠٠٠٠ ده ملیۆن خێزان ته‌نها دایکی هه‌یه ودایکیش به‌ته‌نها به‌خێوکه‌ره.

له ولآته عه‌لمانیه‌کانتدا له‌یه‌ك ولآتیاندا ١٣٢٠ هه‌زار وسێ سه‌د بیست ئافره‌ت سالآنه ده‌کوژرێن له‌لایـه‌ن پیاوه‌کانیـان یـان هاورێکانیـان «گێـرڵ فرێند» «girlfriend»ه‌وه، واته ڕۆژی چووار ئافره‌ت.

هه‌روه‌ها له ولآته عه‌لمانیه‌کانتدا له‌یـه‌ك ولآتیانـدا لـه کـۆی کوشـتنی هه‌موو ئافره‌تان ٤٠ بۆ ٥٠٪ له‌لایه‌ن هاوسه‌ر وهاوڕێکانه‌وه‌یه.

هه‌روه‌ها له ولآته عه‌لمانیه‌کانتدا له‌یـه‌ك ولآتیانـدا سـالآنه ٣٠٠٠٠٠٠ سێ ملیۆن ئافره‌ت ده‌ستدرێژی جه‌سته‌یی ده‌کرێته سه‌ریان له‌لایـه‌ن مێـرد یان هاوڕێوه.

له ولآته عه‌لمانیه‌کاندا ٩٧٪ پله بالآکانی نێو گـه‌وره کۆمپانیاکـان بـه ده‌ست پیاوه‌وه‌یه.

هه‌روه‌ها له ولآته عه‌لمانیه‌کاندا زۆربـه‌ی ئافره‌تـان لـه‌و شـوێنانه کـار ده‌که‌ن که پاره‌که‌ی که‌متره وپله‌که‌ی نزمتره.

لـــه ولآتـــه عه‌لمانیه‌کانـــدا له‌یـــه‌ك ولآتیانـــدا ٨٩٪ خزمـــه‌تکار وپاککه‌ره‌وه‌کان ئافره‌تانن.

له ولآته عه‌لمانیه‌کاندا له‌یه‌ك ولآتیاندا ٧٨٪ سه‌ربازه ئافره‌تان له هێـزه چه‌کداره‌کان ته‌حه‌روشی جنسیان پێوه کراوه له‌لایه‌ن سه‌ربازه‌کانی تره‌وه.

لــــه ولاتــــه عـەلمانیەکانتــــدا دیاردەیـــەك بلاوبۆتـــەوە بریتیـــە لـــە پێشکەشکردنی خواردن لەســەر جەســتەی ئــافرەت بــە ڕوتــی وبــە ڕوتــی نمایشکردنیەتی لەتەنیشی ئۆتۆمبیلەوە.

له یەك ولاتی عـەلمانیدا ساڵانە ٥٠٠٠٠ پەنجا هــەزار ئــافرەت ومنــداڵ دزەیـــان پێـــدەکرێت وبـــە کۆیلـــە دەکـــرێن ومـــەجبوور دەکـــرێن لەســـەر لەشفرۆشی[1].

له ولاته عـەلمانیەکاندا لەیەك ولاتیاندا داهاتی ساڵانەی لاشەی ئــافرەت ١٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠ دووانزە ملیار دۆلارە.

له ولاته عـەلمانیەکاندا له یەك ولاتیاندا نزیکەی نیوەی ئەو ئافرەتانــەی له سەروی ٧٥ حەفتا وپێنج ساڵیدان به تەنها دەژین[2].

حەزت له زیاتر بوو! هەمتر زۆرە!

بــەڵێ عـەلمانیـــەت هـــات بـــەها بەرزانـــەکان ناهێڵێـــت. وپیســـیەکان دەهێنێت.

---

(١) ئەمشەو (٥ تەموزی ٢٠١٧) له ئیســپانیا پــۆلیس لــە هەڵمەتێکــدا ســیازدە ئافرەتی ئازاد کردووە کە بە زۆر لەشفرۆشیان پێوەکراوە، کە بــی بــی ســی نوســیویەتی تەحریر وەك ئەوەی بە کۆیلە کرابێتن.

(٢) ئەمە مشتێك بوو لە خەرمانی ناموبارەکی عەلمانیەکان وبەرپرسم لەهەر زانیاری وژمارەیەك لەو ژمارانە، خواش سبحانە سەرکەوتو کاری عەبدەکەیەتی.

# لەمانەدا ئیسلام دژی مافەکانی مرۆڤە

لە پرسیاری ئەوەی کام ئەحکامانـەی ئیسـلامە، کـە دژی مافـەکانی مرۆڤە؟ ئەڵێ: «شەریعەی ئیسلامی ئینسان دابەش دەکات بـۆ موسـڵمان ونا موسڵمان، پیاو وئافرەت، هاونیشتمانی لە ئارادا نیـە، عالـەم تـەوزیع دەبێت بۆ دارولئیسلام ودارولحەرب».

سەرنج بدەن ئەڵێ ئیسـلام، کەواتـە کێشـەیان لەگـەڵ ئیسـلامە، یـا ئیسلامی سیاسی؟

**دووەم:** ئەو قسە زلەی پێشوت کە: «کۆمەڵێ ئەحکامی شەرعی هەیـە پێچەوانەی هەموو مافەکان وبەها وپرەنسـیپە گەردوونیەکانـە»، چـاوەڕێ دەکرا نمونەیەك بهێنیتەوە کە ئەوەندەی قسەکەت زل بێـت بـەڵام وا نـەبوو نمونەیەکت هێناوە لە هـەموو دوونیـا وایـە وەك باسـی دەکـەین پشـتیوان بەخوا.

**سێیەم:** مەبەستت چیە لـەوەی ئیسـلام ئینسـان دابـەش دەکـات بـۆ موسڵمان ونا موسڵمان؟

د. فـاروق بـێ زەحمـەت ئەگـەر دەوڵـەت عـەلمانی بێـت ودەوڵەتەکـە موسڵمان ونا موسڵمانی تێدا بوو، ئەوسا بە موسـڵمان ونـا موسـڵمان چـی ئەکەن؟ وچی پێئەڵێن؟ ناویان دەگۆڕن بۆ چی؟

خۆ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە دەوڵەتی ئیسلامی جیاوازیان دەکات لە ماف وئیمتیازدا؛ وەکو ئەوەی موسڵمان ونامو سڵمانێك یەکسان نین لەبەرامبەر دادگا، ئەوە ناڕاستیەکی شاخدارە، بە شاهیدی دەقەکان ومێژو وواقعی وڵاتانی ئیسلام.

یەکێك لەو نمونە بەناوبانگانەی لە مێژوی ئیسلامدا باسدەکرێ، دەگێڕنەوە: جارێکیان پێشەوای ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبووتالب قەڵغانەکەی لای جولەکەیەك دەبینێتەوە وداوای لیدەکات، بەڵام کابرا دەدات لەژێری[1]، کە ئەیهێنێتە لای شورەیحی دادوەر، لە تەنیشتیەوە دایدەنیشێت، وئەڵێ: شاهید بهێنە، ئەڵێ: حەسەنی کوڕم شاهیدە، ئەڵێ: شاهیدی کوڕ قەبووڵ ناکەم، تا سەرەنجام ناتوانێت بیسەلمێنێت، ودادوەریش قەڵغانەکە ناداتە عەلی وئەیدات بە کابرای جولەکە، وئەویش ئەم دادگەریە دەبینێت موسڵمان دەبێت وقەڵغانەکە دەداتەوە، ئەویش ئەڵێ: مادام موسڵمان بووی، پێشکەشت بێت[2].

---

(١) واتە: نکوڵی لێدەکات.

(٢) ئەم چیرۆکە بەیهەقی دەیگێڕێتەوە لە «السنن الکبری» (١٠/١٣٦)، لە «باب إنصاف الخصمين في المدخل عليه والاستماع منهما والإنصات لكل واحد منهما حتى تنفد حجته، وحسن الإقبال عليهما» «... عن الشعبي قال: خرج علي بن أبي طالب إلى السوق، فإذا هوبنصراني يبيع درعا، قال: فعرف علي الدرع فقال: هذه درعي، بيني وبينك قاضي المسلمين. قال: وكان قاضي المسلمين شريح، كان علي استقضاه. ... فقال له علي: اقض بيني وبينه يا شريح. فقال شريح: ما تقول يا أمير المؤمنين؟ قال: فقال علي: هذه درعي ذهبت مني منذ زمان. قال فقال شريح: ما تقول

یەکێکی تر لەو نمونە بەناوبانگانەی کە باسدەکرێ، دەگێڕنەوە: جارێکیان کابرایەکی قیبتی پێشبڕکێی لەگەڵ کوڕەکەی عەمری کوڕی عاسدا کردووە ولێی بردۆتەوە، ئەویش بە شەلاق هاتۆتە کابرایە، ئەمیش خۆی گەیاندۆتە لای پێشەوا عومەر، ئەمیش ڕاستەخۆ نامەی نوسیوە بۆ عەمر وئەڵێ: خۆت وکوڕەکەت ئامادە بن، دووای شەلاق دەدات بە دەستی کابراوە وئەڵێ لێی بدە، ئەویش زۆری لێدەدات، وپاشان بە عەمر ئەڵێ: «يَا عَمْرو! مَتَى اسْتَعْبَدْتُم النَّاسَ وَقَدْ وَلَدَتْهُم أُمَّهَاتُهُم أَحْرَاراً؟» واتە:

---

يا نصراني؟ قال: فقال النصراني: ما أكذب أمير المؤمنين! الدرع هي درعي. قال فقال شريح: ما أرى أن تخرج من يده، فهل من بينة؟ فقال علي: صدق شريح. قال فقال النصراني: أما أنا أشهد أن هذه أحكام الأنبياء، أمير المؤمنين يجيء إلى قاضيه، وقاضيه يقضي عليه، هي والله يا أمير المؤمنين درعك، اتبعتك من الجيش وقد زالت عن جملك الأورق، فأخذتها، فإني أشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمدا رسول الله. قال: فقال علي: أما إذا أسلمت فهي لك. وحمله على فرس عتيق، قال فقال الشعبي: لقد رأيته يقاتل المشركين». وقال في آخره: «وروي من وجه آخر أيضا ضعيف عن الأعمش عن إبراهيم التيمي». وقال ابن الملقن: «في إسناد هذا الحديث ضعفاء». وقال ابن الصلاح: «هذا الحديث لم أجد له إسنادًا يثبت»» «البدر المنير» (٥٩٩/٩). وذكر القصة الجوزقاني في «الأباطيل» (١٩٧/٢). وقال: «هذا حديث باطل تفرد به أبووسمير وهومنكر الحديث...». وأخرجه أبونعيم في «الحلية» (١٣٩/٤) من طريق حكيم بن خذام أبووسمير، ثنا الأعمش، عن إبراهيم بن يزيد التيمي، عن أبيه. وذكرها ابن الجوزي في «العلل المتناهية» (٣٨٨/٢).

أما متنه من حيث العدالة في زمن الخلفاء الراشدين فلا شك في ذلك والحمد لله.

«ئەی عەمر ئەمە لە کەیەوە خەڵکتان کردووە بە کۆیلە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون!؟»[1].

---

(١) ئەم چیرۆکە «أبووالقاسم ابن عبد الحكم المصري» لە «فتوح مصر» (ص٢٩٠)، طبعة دار الفكر، دەیگێڕێتەوە ئەڵێ: «حدثنا أسد بن موسى، حدثنا مهدي بن ميمون، حدثنا سعيد الجريري، عن أبي نضرة عن أبي فراس: أن عمر بن الخطاب خطب الناس؛ فحمد الله وأثنى عليه؛ ثم قال: إيها الناس إنه قد أتى علي زمان وأنا أحسب أن من قرأ القرآن إنما يريد به الله وما عنده، وقد خيل إلي بآخره أنه قد قرأه أقوام يريدوون به الدنيا ويردوون به الناس، ألا فأريدووا الله بأعمالكم، وأريدووه بقراءتكم، ألا إنما كنا نعرفكم إذ ينزل الوحي وإذ رسول الله ﷺ بين أظهرنا وإذ ينبئنا الله من أخباركم، فقد انقطع الوحي وذهب النبي ﷺ فإنما نعرفكم بما نقول لكم الآن من رأينا منه خيرا ظننا به خيرا وأحببناه عليه، ومن رأينا منه شرا ظننا به شرا وأبغضناه عليه، سرائركم فيما بينكم وبين ربكم، ألا إني إنما أبعث عمالي ليعلموكم دينكم ويعلموكم سننكم، ولا أبعثهم ليضربووا ظهوركم ولا يأخذوا أموالكم، ألا فمن أتى إليه شيء من ذلك فليرفعه إلي، فوالذي نفس عمر بيده لأقصنه منه، فقام عمروبن العاص فقال: أرأيت يا أمير المؤمنين إن عتب عامل من عمالك على بعض رعيته، فأدب رجلا من رعيته إنك لمقصه منه؟ قال: نعم، والذي نفس عمر بيده لأقصنه منه، ألا أقصه وقد رأيت رسول الله ﷺ يقص من نفسه. ألا لا تضربووا المسلمين فتذلوهم، ولا تمنعوهم حقوقهم فتكفروهم، ولا تحمروا بهم فتفتنوهم، ولا تنزلوهم الغياض فتضيعوهم.

فأتى رجل من أهل مصر كما حُدِّثنا عن أبي عبدة عن ثابت البناني وحميد عن أنس إلى عمر بن الخطاب فقال: يا أمير المؤمنين عائذ بك من الظلم، قال: عذت معاذا، قال: سابقت ابن عمروبن العاص فسبقته، فجعل يضربني بالسوط ويقول: أنا ابن الأكرمين، فكتب عمر إلى عمرو: يأمره بالقدووم عليه، ويقدم بابنه معه، فقدم، فقال عمر: أين المصري، خُذْ السوط فاضرب، فجعل يضربه بالسوط، ويقول عمر: اضرب ابن الأليمين [أي: الألأمين]، قال أنس: فضرب، فوالله لقد ضربه ونحن نحب ضربه، فما أقلع عنه حتى تمنينا أنه يرفع عنه، ثم قال عمر للمصري: ضع على صلعة عمرو، فقال: يا أمير المؤمنين إنما ابنه الذي ضربني وقد اشتفيت منه، فقال عمر لعمرو: مُذْ كَمْ تعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارًا؟ [وفي رواية: يا عمرومتى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارًا؟ ثم التفت إلى المصري فقال: انصرف راشدًا فإن

رابك ريب فاكتب إلي] قال: يا أمير المؤمنين لم أعلم ولم يأتني [وفي ورواية: فجعل يعتذر ويقول: إني لم أشعر بهذا]». وهي في «التذكرة الحمدوونية» (٣/٢٠٩)، و«كنز العمال» (١٢/٦٦٠)، و«أخبار عمر» لابن الجوزي (٣٨٢)، و«العقد الفريد» للملك السعيد لابن طلحة (٥٩). و«المستطرف في كل فن مستطرف» للأبشيهي (١/٢٣٨).

أما صاحب «فتوح مصر وأخبارها»؛ أبي القاسم عبد الرحمن بن عبد الله عبد الحكم القرشي المصري، قال عنه أبووحاتم: «صدووق». وقال عنه النّسائي: «لا بأس به». وقال ابن يُونس: «ثقة». وقال القضاعي: «كان مِن أهل الحديث، عالمًا بالتواريخ، صنّف تاريخ مصر وغيره». ينظر: «تهذيب التهذيب» (٦/١٨٨ - ١٨٩).

وأما «أسد بن موسى بن إبراهيم الأموي»» قال النسائي وسعيد بن يونس: «ثقة»، واستشهد به البخاري، وقال: «مشهور الحديث، يُقال له: أسد السنّة». ينظر: «ميزان الإعتدال» (١/٢٠٧)، و«سير أعلام النبلاء» (١٠/١٦٢ - ١٦٣).

وأمّا «أبووعبدة» فهو «يوسف بن عبدة البصري العتكي الأزدي» مختلف فيه، قال ابن معين: «ثقة»، وقال الحافظ في «التقريب»: «يوسف بن عبدة الأزدي مولاهم أبووعبدة البصري القصاب لين الحديث من السابعة». «تهذيب التهذيب» (١/٣٦٦). وقال الذهبي: «ثقة»، «الكاشف» (٢/٤٠٠). وقال أبووبكر الأثرم: «قلت: لأبي عبد الله أحمد بن حنبل، يوسف بن عبدة أبووعبدة؟ قال: «له أحاديث مناكير عن حميد وثابت، وكأنه ضعفه». وقال ابن أبي حاتم: «سألت أبي عن يوسف بن عبدة؟ فقال: «شيخ ليس بالقوي، ضعيف» «الجرح والتعديل» (٩/٢٢٦). وذكره العُقيلي في «الضعفاء» (٤/٤٥٦) ونقل قول أحمد فيه. وذكر له حديثًا منكرًا، أنكره عليه حماد بن سلمة - وهومن أقرانه- وهوحديثه عن ثابت عن أنس: «أنه أوصى إذا مات أن يوضع في فمه شعر من شعر النبي ﷺ»، قال أبووسلمة (روايه عنه): «فحدثت به حماد بن سلمة فأنكره! وحرك رأسه، وقال: «إذا حدثك هؤلاء الشيوخ عن ثابت بشيء فاتهمهم»».

وذكره ابن حبان في «الثقات» (٧/٦٣٩).

وأما حميد بن أبي حميد الطويل [ولم يكن طويلا ولكن لطول يديه، أوكان له جار يقال له: حميد القصير، فقيل: حميد الطويل ليعرف من الآخر]: قال الذهبي «الإمام الحافظ». وقال النسائي: «ثقة». وقال ابن سعد: «كان ثقة كثير الحديث، إلا أنه ربما دلس عن أنس». ينظر: «تهذيب التهذيب» (٣/٤٠). ولا يضر تدليسه هذا لأنه سمعه من ثابت البناني وهوثقة.

خۆ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە ناموسڵمانێك ناتوانێت ببێتە سەرۆكی وڵاتی موسڵمانان، ئەوە لە دەستوری وڵاتە هەرە عەلمانیەكانی دوونیا بۆم نەقڵ كردی كە سەرۆكی وڵات ئەبێت هەڵگری ئاینی زۆرینە بێت ئەوسا مافی خۆپاڵاوتنی هەیە.

ئیتر بۆچی بۆ ئەوان دیموكراتیە، بەڵام بۆ ئیسلام دیكتاتۆریە؟!

## ئیسلام دەیكاتە ژن و پیاو! ئەی عەلمانیەت چی لێدەكات؟

**چووارەم:** سەبارەت بەوەی ئەڵێ ئیسلام: «مرۆڤ دابەش دەكات بۆ: پیاو وئافرەت». ئەرێ بێ زەحمەت ئەی دەوڵەتی عەلمانی ئەیكاتە ژن وژن، یان پیاو وپیاو یان میاو یان چی؟! چۆنی لێدەكات بۆ ئەوەی عونسریەت دروست نەبێت وجیاوازی نەمێنێت!

**ئەگەریش** مەبەستت ئەوەیە ئیسلام جیاكاری دەكات لە نێوان نێر ومێ، بۆ نمونە: نێر ومێ لە قوتابخانە وزانكۆكان وهتد جیا دەكاتەوە وناهێڵێت پێكەوە بخوێنن، ولە میرات جیاوازی دەكات وپیاودووبەرامبەری ژنە وهتد.

---

وأما ثابت بن أسلم البُنَانيّ [قرية من قرى نيسابورر]: قال عنه الذهبي: «الإمام، القدووة، شيخ الإسلام» وكفى به ترجمة.

ولكن يبقى أن شيخ صاحب «فتوح مصر وأخبارها» مجهول.

وكذلك بينه وبين أبي عبدة انقطاع، فيكون منقطعًا. فابن عبدالحكم توفي (٢٥٧هـ)، وأبووعبدة توفي تقريبًا (١٦٧هـ أوبعدها أوقبلها بقليل). فبينهما (٩٠) سنة تقريبًا.

وفي متنه شيء من النكارة. فهذا خلاصة بحثنا في هذا الحديث.

**سەرەتا** ئەڵێم: ڕاست نیە جیاکاری نەکراوە، هەردووکیان وەکو یەکن مەگەر بە دەقێك جیا ببنەوە.

باوەڕ بە پەیامبەری ئیسلام دەکەیت؟ دەی ئەوە خۆی ﷺ ئەفەرموێ: «النساء شقائق الرجال»[1] واتە: «ئافرەتان هاوتای پیاوانن». ئەمەشی کەی فەرمو؟ کاتێك باسی شتێکی کرد. وتیان: ئەی ئافرەت؟ فەرموی: «ئافرەتان هاوتای پیاوانن».

**سەبارەت** بەوەی نێر ومێ لە قوتابخانە وزانکۆکان وهتد جیا دەکاتەوە، بەڵێ لە وڵاتانی ڕۆژئاوا وئەمریکاش جیا کراوەتەوە ودەستیان پێکردووە وخەریکن، دەیان زانکۆ جیاکرایەوە، هەروەها لە وڵاتە عەلمانیەکاندا ئەگەر ئاینێك باوەڕی بە تێکەڵاوی نەبێت ڕێی پێدەدات، وەکو لە سویسرا چەندین قوتابخانەی جولەکەکان هەیە تێکەڵاو نیە لەبەر بیرکردنەوەی

---

(١) «مسند أحمد» (٥٨٦٩)، و«سنن الترمذي» (١٠٥)، و«سنن أبي داود» (٢٠٤). وسببه أنه: «سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا قَالَ: «يَغْتَسِلُ»، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدِ احْتَلَمَ وَلاَ يَجِدُ الْبَلَلَ؟ قَالَ: «لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ»، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: الْمَرْأَةُ تَرَى ذَلِكَ أَعَلَيْهَا غُسْلٌ، قَالَ: «نَعَمْ إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»». وصححه ابن رجب في «الفتح» (١/٣٤٣)، والألباني.

ومعنى الحديث: «أي نظائرهم وأمثالهم كأنهن شُققن منهم؛ ولأن حواء خلقت من آدم عليه الصلاة والسلام وشقيق الرجل أخوه لأبيه ولأمه؛ لأنه شق نسبه من نسبه، يعني فيجب الغسل على المرأة برؤية البلل بعد النوم كالرجل». «عون المعبود» (١/٤٠٠).

تایبەتی ئەو ئاینە، کەواتە لــە دیــدی عەلمانیەتــەوە جیاکردنــەوەیان تــاوان نیە.

**هەروەها** ئیسلام واقعیانە وزانســتیانە بڕیــاری داوە، هــەموو کەســێك دەزانێت ئەم دوو ڕەگەزە ئارەزویان بۆ یەکتر دەڕوا، بۆیە کاریگەری لەســەر خوێنــدیان وئاینــدەیان دەبێــت، بۆیــە جیــا دەکرێنــەوە، کۆمــەڵێك لــە کۆمەڵناسان وشارەزایانی وڵاتان گەیشتونەتە ئەم قەناعەتە، خوا یــار بێــت لە کتێبی «زینا، هۆکار، چارەسەر» بەڵگەی زیاتر دەبینی.

**پاشان** کە ناهێڵێت پێکەوە بخـوێنن، قەیـدی چـیە؟ وەکـو ئـەوە وایـە ئەمڕۆ ناهێڵن پێکەوە یاری بکەن! ئەرێ بەڕێزان ئەوە بـۆ جـامی جیهـانی پیاوان وئافرەتان جیایە؟ بۆ ئەم جیاکاریـە!؟ ئـەوە بـۆ گۆڕەپـان ومەیـدان پێکەوە ناکەن وڕێگەش نادەن پێکەوە بیکەن؟! ئـەوە بـۆ زۆربـەی پۆسـتە باڵاکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە دەستی ئافرەتەوە نیە؟! بۆ موچەی ژن وپیاو لە هەندێ وڵاتی ڕۆژئاوا وەکو یەك نیە؟ بۆ لە بریتانیا کە هـەتا ئـەم سـاتەی من ئەم قسانە دەکەم موچەی ژن وپیاو یەکسان نیە لە هەندێ ڕووەوە.

ئەوە بۆ؟ ئەوە بۆ؟! دەیان پرسی تر!

سەبارەت بەوەی لە میرات جیاوازی کردووە لــە نێوانیــان، واللە ڕاســت دەکات ئیسلام جیاوازی کردووە، بەڵێ جاری وا هەیـە زۆرتـر بـە ئـافرەت

دەدات وجاری واش هەیە زۆرتر بە پیاو دەدات بەپێی بەرژەوەنـدی[1]، ئـیتر ئەمە چ نەنگیەکی تێدایە؟ کەواتە ئەو تەپڵەی لـە ئاهـەنگ وکۆبوونـەوەی عەلمانی ودژە دینەکاندا لێـی دەدرێ ودەوترێتـەوە: کـە میراتـی پیـاو دوو ئەوندەی میراتی ژنە، پێستەکەی تەقی، جا بیگۆڕن.

ئەمە سەرباری ئەوەی کە لە حاڵەتێکدا ئافرەتەکە کەمتری برد، ئەو هیچ خەرج ناکات، وبژێوی لەسەر پیاوەکەیە، واتە: زیاتر ئەبات، زیاتر خەرج دەکات. کەمتر دەبات، کەمتر خەرج دەکات. وجگە لەوەی ئەو ئافرەتە دەتوانێ بۆ خۆی ئیش بکات ودەخلی تایبەتی بە خۆی هەبێت.

## هەر لە ئیسلام وا نیە، لە هەموو دوونیا وایە[2]

**پێنجەم:** سەبارەت بەوەی ئەڵێ: «**هاونیشتمانی لە ئارادا نیە، عالەم تەوزیع دەبێت بۆ دارولئیسلام ودارولحەرب**».

بەڵێ لە ئیسلامدا، هەر وڵاتێك یان وڵاتی شەڕە، یـان وڵاتـی ئاشـتیە «وڵاتی ئیسلام»، یان وڵاتێکە پەیمانی لەگەڵ گرێدراوە. ئەمەش لە هەموو وڵاتێکـدا هەیـە، بـۆ نمونـە ئێسـتا کوردسـتانی خۆمـان -خـوای مـەزن بیپارێزێت لە دووژمن وناحەزانی-، کۆمەڵێك وڵات هاوپـەیمانین، کۆمـەڵێ

---

(١) ئەوەش تەنها لە حاڵەتی تەعصیبدا نیوەی پێدەدرێت.

(٢) جا ئەمە یاساکە هەرگیز خیلافیم نەبینیوە، ئـەویش ئەوەیـە لـە چـیدا ئیسـلام عەیبدار کرا، ئەگەر بگەڕێی هاوشێوەی لە یاسا ودەستور وڕێسای زۆر وڵاتدا هەیە. ولە چیدا حەزتان لێبوو بپرسن پشتیوان بەخوا هاوشێوەکەیتان پێدەڵێم بە لە ملدانیشەوە.

ولاّتیش بۆ کوردستان مەترسی شەڕی لێدەکرێ کە ئاژاوە لە ولاّت بنێنـەوە وشەڕ بەرپا بکەن یان پەلاماری کوردستان بدەن، کوردستان خۆیشی ولاّتـی ئاشتی وئیسلامە.

وهەر ولاّتێـك ئـەم دابەشـبەندیە نـەکات ولیسـتی دۆسـت ودووژمـن وهاوپەیمانەکانی خۆی نەزانێت، ئەوە بێگومان لە گوێی گادا خەوتوە وهـەر زو تیاچووە ودەوڵەتی واش بڕوا ناکەم لەسەر ئەم ئەرزە هەبێت!

هەروەها هەر شوێنێك کافرانی تێدا نیشتەجێ بێت، مـەرج نیـە پێـی بووترێ دارولحەرب، بـەڵکو جـاری واهەیـە دارولئیسلامیشـە وکـافرانیش تێیدا نیشتەجێن.

جـا قوربـان بەمـەش بـۆت ڕون بوویـەوە بووهتـانتکرد کـە وتـت هاونیشتیمانی بوون لە ئیسلامدا بوونی نیـە. ئـەوەتانێ کـافرانیش تێیـدا نیشتەجێن، کەچـی بـە ولاّتـی ئیسـلام دادەنرێـت ئەگـەر لـەژێر ڕکێفـی ئیسـلامدا بێـت، هـەروەها مامەڵـەی هاولاّتیـەکیان لەگەڵـدا دەکرێـت وهێرشیان بکرێتە سەر پێویستە لەسەر دەوڵەت جاڕی جیهـاد لێبـدات لـە دژی داگیرکەران بجـەنگێت. ئەمـەش کەسـێك تـۆزێ لـە ئیسـلام بزانێـت دەیزانێت. کەواتە بۆتمان سەلماند کە کافر مافی هاونیشتمانی بـوونی هەیـە وبووهتان دەکەیت بۆ ئیسلام.

«البجيرمي» له زانا شافعیەکان پێناسەی دارولئیسلام دەکات وئەڵێ: «وَالْمُرَادُ بِبِلاَدِ الإِسْلاَمِ كُلُّ بَلَدٍ بَنَاهَا الْمُسْلِمُونَ؛ كَبَغْدَادَ وَالْبَصْرَةِ، أَوأَسْلَمَ أَهْلُهَا عَلَيْهَا؛ كَالْمَدِينَةِ وَالْيَمَنِ، أَوفُتِحَتْ عَنْوَةً؛ كَخَيْبَرِ وَمِصْرَ وَسَوَادِ الْعِرَاقِ، أَوصُلْحًا وَالأَرْضُ لَنَا وَالْكُفَّارُ سَاكِنُونَ فِيهَا، وَيَدْفَعُونَ الْجِزْيَةَ»[1].

ماوەتەوە بڵێم: ئەمانە بوون دژی هەموو ماف وپرەنسیپەکان؟!

## له ئیسلامدا ئازادی بیروڕا هەیە؟

سەبارەت بەوەی ئەڵێ: «**لە ئیسلامدا ئازادی بیروڕا نیە**». هەڵبەت ئەمە ڕاست نیە وبووهتانە. بەڵام تا زیاتر ڕونی بکەمەوە ئەبێت بزانین ئازادی بیروڕا ڕەهایە وبێ سنورە، یان نا؟ بێگومان هەمووان کۆکین لەسەر ئەوەی تا سنورێك ئازادیت لە دەربڕینی بیروڕات.

کەوابێت ئیسلام هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ئازادی بیروڕا نیە[2].

لەوانەیە بڵێی: «ئاخر لە ئیسلامدا ناتوانیت بڕۆی قسە بە ئیسلام بکەیت! ئیتر چۆن ئازادی بیروڕا هەیە» ئەڵێم: ئەتوانی قسە بە دەستوری

---

(١) «حاشية سليمان البجيرمي على شرح منهج الطلاب» مطبعة مصطفى البابي الحلبي، (١٨٩/٣).

(٢) جارێکی تر لەم وتەیە ورد بوومەوە، هیچم تێدا بەدی نەکرد، ئەگەر هەر دڵسۆزێك، زیاتر لەوەی ئێمە دەبینێ، دەتوانێ شوێنی ئیشکالەکەی ئەم وتەم بۆ ڕون بکاتەوە. ولەو نوکتە خۆشانە یەکێکیان وتبووی: بەڵگە لەسەر ئەوەی هەڵەیە، ئینتەرێکی داناوە وهاتۆتە خوارەوە! فیلی لە چاوی خۆی نەدی، پوشی لە چاوی ئەو دی! ئەمەش چڵە پۆپەی دەمارگیریە! ولوتکەی کوێریە خوا پەنامان بدات.

کام وڵات بکەی؟ کێ لێت قەبووڵ دەکات سوکایەتی بە دەستور ویاساکەی بکەیت؟ بەڵکو لە دەستوری چەندین وڵاتی عەلمانی خوێندوومەتەوە[1] کە ئەبێت ئەوەی دەیکەیت بە دەر نەبێت لە یاسا گشتیەکان وەگەرنا قەدەغەیە!

بەڵکو ئەگەر ئەتوانی برۆ لە یۆنان ڕەخنە لە ئاینی دەوڵەت بگرە؟! بەپێی دەستور قەدەغەیە! ئایا بەوە یۆنان لە ئازادی دەکەوێت؟!

من ئەم بابەتانە بۆ گۆڤارێك دەنوسم ئەگەرنا زیاتر هەڵدەگرێت.

## پەیامبەر ﷺ مورتەددی بە دەستی خۆی نەکوشتوە!

کە ئەشڵێ[2]: «لەسەردەمی پێغەمبەردا ولەسەر دەستی پێغەمبەر خۆی خەڵکی مورتەد کوژراوە». هەقی خۆمانە بڵێین: کوا؟ لە کوێ هاتوە؟ کێ ریوایەتی کردووە؟ واللە ناڕاست وبووهتانە هەرگیز نەچەسپاوە لە پەیامبەرەوە ﷺ یەك مورتەددی کوشتبێ.

ئاخر چۆن ڕێگە بە خۆتان دەدەن وجورئەت دەکەن ناڕاست بەدەم پەیامبەرەوە ﷺ دەڵێن لە کەناڵێکی ئاسمانی کە هەزاران خەڵك تەماشای دەکات؟!

---

(١) ئەگەر حەزت کرد بڵێ: لە دەستوری هەموو دوونیا وایە، باوەڕ ناکەم درۆ بێت

(٢) ئەمجارە م.هاوژین.

من زۆرم پێ سەیرە لە کۆندا بێ باوەڕ هەبووە وتویەتی: سوێند بێت زوبانم ببڕن درۆ ناکەم، لەبەر کەسایەتی خۆی عەیبی لێهاتوە.

ئەبوو سوفیان کافرە، نەجاشی پرسیاری پەیامبەری ﷺ لێدەکات: وەکو خۆی وەڵامی دەداتەوە ودرۆ ناکا، ئەڵێ یەك شت نەبێت مەجالێکی تێدا بوو قسەیەکم کرد، ئەویش پرسی: پەیمانی شکاندووە؟ وتم: نەخێر بەڵام ئێستا پەیمانێکمان لەگەڵ بەستوە نازانم لەمەیان چی دەکات؟ هەر ئەوەندە. عەیبیان لێ هاتوە درۆ بکەن! ئاخر کەی ڕەوایە یاسای: «الغاية تبرر الوسيلة»! بەکار بهێنی.

دووێنێ شەو لە کەناڵی ئاسمانی ڕێگ... کە سەر بە حیزبێکی لار ڕەوە وتویەتی: «زۆربەی خەڵکی کوردستان پشتگیری دەستورێکی عەلمانی دەکەن!!» ئاخر بەڕێزان درۆ لە کەسایەتی مرۆڤ دەشکێنێ، چ جای کەناڵێکی ئاسمانی وحیزبێکی فەرمی؟! سبەینێ خەڵك وتی: فلان حیزب درۆزنە ناهەقیان دەگرن؟

## ختامًا

لە کۆتاییدا ... ئەڵێم: با هەموولایەك بزانن دژایەتی کردنی ئیسلام هەروا ئاسان وسانا نیە، چوونکە مێژو تۆماری دەکات، جگە لەوەی سەرشۆڕی قیامەتی بە دوواوەیە -پەنا بەخوا-. خۆ ئەگەر هەر بڕیارتان داوە دژایەتی ئیسلام بکەن ئەوا ئەبێت زانست وزانیاریەکی زۆرتان

سەبارەت بە ئیسـلام هـەبێت، تـا جوانیـەکانی ئیسـلام ببینـن وچـی دی دژایەتی نەکەن، خۆ ئەگەر هەر سورن لەسەر ئەوکارە چۆن هاوشـێوەکانتان لە مێژو وهاوچەرخدا شکست یاوەریان بوو، پشـتیوان بـەخوا سـەرەنجامی ئێوەش هەر شکست ودۆڕان ودووابڕان ودابڕان ودارمانە.

والحمد لله رب العالمين

# پێڕستی بابەتەکان

علي خان

# گۆشتی بەراز خۆشە یان وشتر؟!

## وەڵامی ئەم پرسیارە پڕ لوغزە

«گفتوگۆیەك لەگەڵ مەلا بەختیار»

چاپی یەکەم ١٤٣٨

بسم الله الرحمن الرحيم

## دەستپێك

کورتە ڤیدیۆیەکی مەلا! بەختیار بڵاوبوویەوە، دەنگدانـەوەی زۆری بـە دووای خۆیـدا هێنـا، وپرسـیارە زەق وخـۆش وپـڕ حیکمـەت ولـۆژیکی وسەیرەکەی ئەو کورتە ڤیدیۆیە ئەوەبوو: تو ویژدانتان گۆشتی بەراز خۆشـە یان وشتر؟! جا منیش بە خێرایی شتێکم لەسەر نوسی وبڵاوم کردەوە، وپێم باش بوو هەر بەو ناونیشانەوە ناوی بهێنم چوونکە هەمووی بەهۆی ئـەوەوە دەزانن باسی چی دەکەم.

## سەرەتا

وەکو زۆرجار دووپاتم کردۆتەوە کێشەی گەورەی موسـڵمانەکان لەگـەڵ نـەیارەکانیان شـارەزا نـەبوونی نەیارەکانیانـە لـە ئیسـلام ولـەو بـارەوە نەخوێندەوارن[1]، جا هـەر لـە کۆنـەوە وتویانـە: «**الناس أعداء ما جهلوا**» واتە: «**خەڵك دووژمنی ئەوەن کە لێی نازانن**».

لەم سۆنگەیەوە لەمەڕ ئەو وتانەی کە چەند ڕۆژێکە لە ئینتەرنێت وکەناڵەکانی ڕاگەیاندن وسایتەکان بڵاوبۆتەوە بە پێویستی دەزانم ئەم چەند

(١) نەخوێندەوار وشەیەکە لە کۆندا مامۆستا ومەلاکان بۆ کەسێك بەکاریان دەهێنـا کـە زۆر سەری لە شت دەرنەکردایە.

خالّەی خوارەوە بخەمە ڕوو کە بەزۆری لە دەوری تەوەری ناونیشانەکە دەخولێتەوە کە ناشارەزایی نەیارانی ئیسلامە بە ئیسلام:

## پێش هەموو شتێك

پێش هەموو شتێك: نەمتوانی تەواوی وتەکانی ئەو کەسەم دەست بکەوێت تەنها ئەو دوو دەقیقە نەبێت کە بلاوبۆتەوە بۆیە وەلامەکەش تەنها لەسەر هەندێك لایەنی ئەو پارچە ڤیدیۆیەیە.

## ئەڵێ: لە قورئان دوو شت حەرامە

ئەڵێ: «**دوو شت لە قورئان حەلاڵ کراوە بەراز وخوێن مردوو... ئەی خوا بۆ؟!**».

**لە وەلامدا ئەڵێم:**

١. **سەرەتا ئەڵێم:** پرسیاری وا ڕاستەوخۆ لەخوا ناکرێت ووەلامیشت ناداتەوە ولە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیشدا ناکرێت، بەڵکو لە زاناکان دەکرێت تا بۆتی ڕون بکەنەوە. وپرسیاریش بە گاڵتە وسوکاتیەوە ناکرێت لە موسڵمانان چ جای خوا تبارك وتعالی! ئەوەیش شتێکی قورس نیە من دەتوانم دەیان پرسیارت ئاراستە بکەم لۆژیکیتر ومەنتقیتر، هەروەها گاڵتە ئامێزانەتر، لەوەی تۆ بێوەلامتر بیّ.

٢. **ئینجا ئەڵێم:** لە قورئاندا زیاتر لەوە حەرام کراوە! ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بە قورئان نەخوێندەوارن. دەی ئەگەر ئەمە عیلمتان

بێت بە قورئان ئەبێت چەند سەر لە سوننەت دەر بکەن. کەوایە بۆ لەسەر دین قسە دەکەن؟

**٣.** ئەگەر مەبەستت لەو دووشتە: بەراز وخوێن مردووە. ئەوا لە قورئان شتی وا نیە بەو شێوازە!!

**٤.** ئەگەریش مەبەستی بەراز وخوێن ومردووە (بە ئامرازی پەیوەندی) ئەوا ئەڵێم ئەمە سیان دەکات نەك دووان. هێشتا هەر واش نیە وەك لە خاڵی یەکەم باسم کرد.

## وشتر موبارەك نیە لە ئیسلامدا!

ئەڵێ: «**لای ئێمە ئەم مەڕە جوانەمان هەیە، حوشتر بۆ سەربڕین! لای ئەوان هیچ نەبووە، حوشتری سەربڕیوە، بۆیە حەڵاڵی کردووە**».

**لە وەڵامدا ئەڵێم:**

**سەرەتا** زۆر بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم ئەویش ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکە کە زۆربەی زۆری چەپڕەو ولادینی وعەلمانیەکان ووهاوشێوەکانیان تێیدەکەون، ئەویش ئەوەیە: لە ئیسلامدا حوشتر ئاژەڵێکی موبارەك نیە ولە دەقەکانی قورئان وحەدیسشدا شتی وا نەهاتوە، یانی بەو شێوازە نیە کە ئەوان وا دەزانن -بە ڕاشکاوی بە خۆشمیان وتوە- کە وشتر ئاژەڵێکی موبارەکە لەلای موسڵمانان.

بەڵکو لە دەقەکاندا پێچەوانەی ئەمە دەبینی، وەك:

# وشتر له دیدی ئیسلامدا

عەبدوولاّی کوڕی موغەفەل وئەبوو هورەیرە وجگە لەویش دەیگێڕنەوە، پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «ئەگەر کاتی نوێژ هات وهیچ شوێنێکتان دەست نەکەوت نوێژی تێدا بکەن تەنها پەچەی مەڕ وبزن ووشتر نەبێت، ئەوا نوێژ بکەن لە پەچەی مەڕ وبزن، بەڵام نوێژ مەکەن لە پەچەی وشتر چوونکە شەیتانی لەگەڵدایە».«إِذَا [حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فـ] لَمْ تجِدووا إلا مَرابِضَ الغَنَمِ، ومَعاطِنَ الإبلِ، فصَلُّوا في مَرابِضِ الغَنَمِ، ولا تُصَلُّوا في أَعْطانِ الإبل [فإِنَّها خُلِقَتْ من الشَّياطينِ]»(١).

هەروەها بەرائی کوڕی عازب ئەڵێ: «پرسیار کرا لە پەیامبەری خوا ﷺ لەبارەی دەست نوێژگرتن بەهۆی خواردنی گۆشتی وشتر؟ فەرموی: دەستنوێژ بگرنەوە بۆی، وپرسیاری لێکرا لە بارەی دەست نوێژگرتن بەهۆی خواردنی گۆشتی مەڕ وبزنەوە؟ فەرموی: دەست نوێژ مەگرنەوە بۆی ...». «سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوُضووءِ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ فَقَالَ: «تَوَضَّئُوا مِنْهَا»، وَسُئِلَ عَنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ فَقَالَ: «لَا تَوَضَّئُوا مِنْهَا»، وَسُئِلَ عَنِ الصَّلَاةِ فِي مَبَارِكِ

(١) أصله في البخاري وهذا الحديث في «سنن الترمذي» (٣٤٨)، وقال: وهو حديث حسن صحيح، و«سنن ابن ماجه» (٧٦٨) و(٧٦٩)، و«مسند أحمد» (١٦٧٩٩) و(٢٠٥٤١) و(٩٨٢٥)، والزيادة الأولى من «سنن الدارمي»، والثانية من «صحيح الجامع» (٣٧٨٨ ، ١٤٣٩). وصححه الشيخ أحمد شاكر وصححه الشيخ الألباني ثم ضعف زيادة: «فإِنَّها خُلِقَتْ من الشَّياطينِ» في ضعيف موارد الظمآن (٢٥- ٣٣٥).

الْإِبِلِ؟ فَقَالَ: «لَا تُصَلُّوا فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ، فَإِنَّهَا مِنَ الشَّيَاطِينِ»، وَسُئِلَ عَنِ الصَّلَاةِ فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ فَقَالَ: «صَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ[1]»[2].

هەروەها لە جابری کوڕی سەمورەوە، ئـەڵێ: «أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلَا تَوَضَّأْ» قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: «نَعَمْ فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ» قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «نَعَمْ» قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: «لَا»»[3]. واتاکەشی نزیکە لە واتای حەدیسی پێشو.

هەروەها لە حەدیسە ڕاستەکاندا بەوە نمونەی هێنراوەتەوە کە زۆر ڕادەکات لە دەست خاوەنەکەی ئەگەر ئاگای لێ نەبێت وچاوی پێوە نەبێت. وەك پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: «تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ

---

(١) «سنن أبي داود» (١٨٤)، و«سنن الترمذي» (٨١)، وصححه، و«سنن ابن ماجه» (٤٩٤)، وصححه ابن راهويه وأحمد والألباني والوادعي.

(٢) وئەم مەسەلەش لە ڕوی فیقهەوە جێی ڕاجیاوازیە، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن دەستنوێژ ناشکێنێت وئەم حەدیسانەش نەسخەوە بوون وکۆمەڵێك بەڵگەشیان هەیە، لەوانە:

عن سعيدِ بنِ الحارثِ عن جابرِ بنِ عبدِالله، أنَّه سألَه عن الوُضوءِ ممَّا مسَّتِ النَّارِ؟ فقال: «لا؛ قد كنَّا زمانَ النبيِّ ﷺ لا نجِدُ مثلَ ذلك مِن الطَّعامِ إلَّا قليلًا، فإذا نحن وَجَدْناه لم يكُن لنا مناديلُ إلَّا أكفُّنا وسواعِدُنا وأقدامُنا، ثم نصلِّي، ولا نتوضَّأُ». «صحيح البخاري» (٥٤٥٧).

وعن جابرٍ قال: «كان آخِرُ الأمرينِ مِن رسولِ الله ﷺ تَرْكَ الوضوءِ ممَّا غيَّرَت النَّار». وفي رواية: «ترْك الوضوءِ ممَّا مسَّتِ النَّار». «سنن أبي داود» (١٩٢)، و«سنن النسائي» (١٨٥). وصححه الألباني.

(٣) «صحيح مسلم» (٣٦٠).

لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ الْإِبِلِ فِي عُقُلِهَا»[1]. یا ئەفەرموێ: «إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ»[2].

هەروەها لە حەدیسی سەحیحدا هاتوە ئەفەرموێ: «هەمووتان ئەڕۆنەوە بەهەشتەوە مەگەر كەسێك نەیەوێت وپشت هەڵبكات وەك پشتهەڵكردنی وشتر». وەك ئەبوو هورەیرە وئەبوو ئومامەی باهلی ئەڵێن: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَتَدْخُلُنَّ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى وَشَرِدَ عَلَى اللهِ كَشِرَادِ الْبَعِيرِ»[3].

هەروەها نەهی كراوە لە موسڵمان وەكو وشتر لە مزگەوت خۆی بەند بكا بە شوێنێكەوە، واتە: بەردەوام لە مزگەوتدا لەیەك شوێندا نوێژ بكات، وەك عەبدوولڕەحمانی كوڕی شیبل ئەڵێ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ، وَافْتِرَاشِ السَّبْعِ، وَأَنْ يُوَطِّنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ فِي الْمَسْجِدِ كَمَا يُوَطِّنُ الْبَعِيرُ»[4].

---

(١) «صحيح البخاري» (٤٧٤٦)، و«وصحيح مسلم» (٧٩١).

(٢) «صحيح البخاري» (٤٧٤٣)، و«وصحيح مسلم» (٧٨٩).

(٣) «مستدرك الحاكم» (٢٤٧/٤)، و«مسند أحمد» (٢٥٨/٥) (٢٢٥٧٩). وقال الحافظ: «وسنده على شرط الشيخين، وله شاهد عن أبي أمامة عند الطبراني، وسنده جيد»، وقال الهيثمي في «مجمع الزوائد» (٧١/١٠) عن حديث أبي أمامة: «رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح غير علي بن خالد، وهو ثقة».

(٤) «مسند أحمد» (٤٢٨/٣)، و«سنن أبي داود» (٨٦٢). «الصحيحة» (١١٦٨).

هەروەها لە ڕۆیشتن بۆ سوژدە نەهی هاتوە وەك وشتر بڕۆی. وەك ئەبوو هورەیرە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ؛ وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ»(١).

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرمویَ: «نوفرەتێکی تێدایە وەحش ئاسا»(٢). وەك ڕافعی کوڕی خەدیج ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ لِهَذِهِ الْإِبِلِ [وفي رواية: لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ] أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ»(٣).

---

(١) «مسند أحمد» (٣٨١/٢)، و«سنن أبي داود» (٨٤٥). و«سنن النسائي» (١٤٩/١)، و«سنن الدارمي» (٣٠٣/١). «الإرواء» (٧٨/٢). فائدة: «الصلاة بكليهما جائزة باتفاق العلماء، إن شاء المصلي يضع ركبتيه قبل يديه، وإن شاء وضع يديه ثم ركبتيه وصلاته صحيحة في الحالتين باتفاق العلماء، ولكن تنازعوا في الأفضل...». «مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام» (٤٤٩/٢٢).

(٢) «صحيح البخاري» (٢٣٥٦، ٢٣٧٢، ٢٩١٠، ٥١٧٩، ٥١٨٤، ٥١٨٧، ٥١٩٠، ٥٢٢٣، ٥٢٢٤)، و«صحيح مسلم» (١٩٦٨)، و«الأوابد» جمع آبدة، وهي التي نفرت من الإنس وتوحشت.

(٣) لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم بچمە سەر هەموو ئەو شوێنانەی باسی وشتری تێدا کراوە لە قورئاندا، تا بەهۆیەوە دەمی خوێندەوارەکان دابخرێ لەم بارەوە:

﴿وَمِنَ الْإِبِلِ اثْنَيْنِ وَمِنَ الْبَقَرِ اثْنَيْنِ قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الْأُنْثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الْأُنْثَيَيْنِ﴾. [الأنعام:١٤٤]، واتە: «دوو جۆر وشتریشی پێ بەخشیون لەگەڵ دوو جۆری مانگا، ئەی پەیامبەر پێیان بڵێ: خوا کام لەمانەی حەرام کردووە وا ئێوە لە خۆتانی قەدغە دەکەن!؟».

﴿هَذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ﴾. [الأعراف:٧٣]، واتە: «باسی پەیامبەر ساڵح ﷺ دەکات کە گەلەکەی پێیان وتوە ئەگەر ڕاست دەکەیت پەیامبەری خوای ئەوە وشترێکی ئاوها وئاوهامان بۆ بهێنە».

﴿فَعَقَرُوا النَّاقَةَ وَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ﴾. [الأعراف:٧٧]، واتە: «هەروەها».

﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا﴾. [الشمس:١٣]، واتە: «هەروەها».

﴿إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ﴾. [القمر:٢٧]، واتە: «هەروەها».

﴿قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾. [الشعراء:١٥٥]، واته: ((هەروەها)).

﴿وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا بِهَا﴾. [الإسراء:٥٩]، واته: ((هەروەها)).

﴿وَيَا قَوْمِ هَذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ﴾. [هود:٦٤]، واته: ((هەروەها)).

﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ كَذَلِكَ سَخَّرْنَاهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾. [الغاشية:١٧]، هەندێکیش ئەڵێن: مانگا ووشتر دەگرێتەوە، واتە: ((وسەربڕینی وشتر بۆ قوربانیکردن وهەدی لە کاتی حەجدا کردوومانە بە یەکێك لە دروشمەکانی خوا تا لە خوا نزیك ببنەوە)).

﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾. [يوسف:٦٥]، واتە: ((باسی براکانی یوسف دەکات کە وتویانە: براکەمان لەگەڵدا بنێرە بارە وشترێك زیاترمان پێدەدرێت)).

﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾. [يوسف:٧٢]، واتە: ((باسی چیرۆکی یوسف دەکات کە وتویانە، هەرکەس جامەکەی پاشا بدۆزێتەوە بارە وشترێکی پێدەدەین)).

﴿وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾. [الأعراف:٤٠]، واتە: ((ناڕۆنە بەهەشتەوە مەگەر وشتر بە کونی دەرزیدا تێبپەڕێت)).

﴿كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ﴾. [المرسلات:٣٣]، واتە: ((پزیسك وپریشکی جەهەننەم کە دەیهاوێژێت وەك وشترە ڕەش وایە زەرد دەربکەوێت)).

﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾. [الغاشية:١٧]، واتە: ((ئەی تەماشای وشتر ناکەن چۆن دروستمان کردووە)).

لەگەڵ ئەو شوێنانەی باسی ((**أنعام**)) هاتوە، چوونکە ((**أنعام**)) بریتیە لە مەڕ وبزن ومانگا ووشتر. ئەویش بە تایبەت باسی وشتر نیە وباسی ئەو سێ وچووار جۆرەیە پێکەوە.

ئەمە هەموو باسی وشترە لە قورئاندا، دەبینی لە هیچکام لەو شوێنانەی قورئاندا باسی بەرەکەتداری وشتر نەکراوە، بەڵێ ئاژەڵێکە وەك هەر ئاژەڵێکی تر وسەرنجام ڕادەکێشێت بۆ عەجیبی دروستکردنی وپەند لێوەرگرتنی وەك هەر دووروستکراوێکی تری وەك ئەو شاخانە.

کەواتە ڕابواردن بە وشتر لە ڕقی موسڵمانان ڕبواردنە بە ئاژەڵێك موسڵمانان لە سۆنگەی ئەو حەدیسانەوە لێی دەڕوانن: بە مەخلوقێکی خوای دەزانن موبارەك نیە لەلایان، وسوکیش نیە لەلایان.

جا ئەمەشتان دیسانەوە بەڵگەیە لەسەر چی؟ بەڵگەیە لەسەر نەخوێندەواریتان بە دینی ئیسلام.

گرنگە ئاماژە بەوەش بکەم: ئەوەی هاتوە کە وەك حەدیس بەناوبانگە لە نێو خەڵك گوایە وشتر وا ووایە، یان: «**لا تسبووا الإبل فإنها من نفس الله تعالى**» سەحیح نیە، وهەندێکی پەندی عەرەبیە، وفڕی بە حەدیسی پەیامبەری خواوە نیە ﷺ.

جا وەك ئەڵێن دیارە بەختانمانە! وتە وپەندە عەرەبیەکان ببێ بە حەدیس لە نەیارەکان. ئەویش هەر بەڵگەی نەخوێندەواریانە بە ئیسلام.

هەروەها ئاماژە بەوەش بکەم کە لە ئیسلامدا بایەخی زۆر بە ئەسپ دراوە وبە بەرەکەتدار وەسفی کراوە نەك وشتر.

جارێکیان پەیامبەر ﷺ دەستی بەنێو چاوانی ئەسپێکدا دەهێنا وئەیفەرمو: «ئەسپ بەرەکەت وخێر لەناو چاوانیەوەیە هەتا ڕۆژی قیامەت»، وەك جەریری کوڕی عەبدوولا ئەڵێ: «**رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْوِي**

نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ وَهُوَ يَقُولُ «الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

هەروەها جارێکیان بە جلوبەرگەکەی نێو چەوانی ئەسپەکە دەسڕێت، وتیان: پەیامبەری خوا بینیمان شتێکت کرد پێشتر نەتکردبوو؟ فەرموی: ئەمشەو گلەیم لێکرا وسەرزەنشتکرام لەسەر ئەسپ»، وەك ئەوەی ئیهمالی کردبێت، یان شتێکی کردبێت بەهۆی سەرقاڵیەوە، بۆیە فەرمانی پێکراوە ڕێزی لێبگرێت[2]. وەك ئەنەس ئەڵێ: «إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَمْسَحُ وَجْهَ فَرَسِهِ بِرِدَائِهِ، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ، وَقِيلَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ! رَأَيْنَاكَ فَعَلْتَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُهُ؟ فَقَالَ: «إِنِّي عُوتِبْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْخَيْلِ»[3].

هەروەها ڕەوحی کوڕی زینباع سەردانی تەمیمی داری دەکات، تەماشا دەکات خەریکە بە دەستی جۆ دەکاتە دەمی ئەسپەکەیەوە ومنداڵەکانیشی لە دەور دەستین، وتم: باشە بە منداڵەکانتی بسپێری ئەو کارەت بۆ ناکەن؟ وتی: بەڵێ، بەڵام گوێم لە پەیامبەر خوا بووە فەرمویەتی ﷺ: هیچ موسڵمانێك نیە بە دەستی خۆی جۆ بکات بە دەمی ئەسپەکەیەوە، مەگەر بەهەر دەنکە جۆیەك چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت. «أَنَّ رَوْحَ بْنَ زِنْبَاعٍ زَارَ تَمِيمًا الدَّارِيَّ، فَوَجَدَهُ يُنَقِّي شَعِيرًا لِفَرَسِهِ،

---

(١) «صحيح مسلم» (١٨٧٢).

(٢) «يعني كأنه أهملها ﷺ، أو صار منه شيء من ذلك، لانشغاله بما هو أهم عنده في تقديره ﷺ، فأمر بإكرامها» «شرح المؤطأ» للشيخ عبدالكريم الخضير.

(٣) «موطأ مالك» (٢/٢٣)، وسنده مرسل، بل معضل. «الصحيحة» (٣١٨٧).

قَالَ: وَحَوْلَهُ أَهْلُهُ، فَقَالَ لَهُ رَوْحٌ: أَمَا كَانَ فِي هَؤُلَاءِ مَنْ يَكْفِيكَ؟ قَالَ تَمِيمٌ: بَلَى، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يُنَقِّي لِفَرَسِهِ شَعِيرًا، ثُمَّ يُعَلِّقُهُ عَلَيْهِ، إِلَّا كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ حَبَّةٍ حَسَنَةٌ»(١).

هەروەها ئەفەرموێ: «قژی نێو چەوانی ئەسپ مەبڕن، هەروەها بان ملی، هەورەها کلکی، چوونکە کلکەکانی دوورخەرەوەن، توکی سەر ملی گەرمکەرەوەن، نێو چاوانیشی خێری تیا گرێدراوە»، وەك عوتبەی ئیبن عەبدی سولەمی، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لاَ تَقُصُّوا نَوَاصِيَ الْخَيْلِ، وَلاَ مَعَارِفَهَا، وَلاَ أَذْنَابَهَا، فَإِنْ أَذْنَابَهَا مَذَابُّهَا وَمَعَارِفَهَا دِفَاؤُهَا وَنَوَاصِيهَا مَعْقُودٌ فِيهَا الْخَيْرُ»(٢).

هەروەها لە سەوادەی کوڕی ڕەبیعەوە ئەڵێ: چوومە خزمەتی پەیامبەر ﷺ فەرموی: ماڵ وسامانت هەیە؟ وتم: بەڵێ، پارەم هەیە، ئەسپم هەیە، ڕەقیقم هەیە. فەرموی: دەستبگرە بە ئەسپەوە با هەتبێت، خێر وبێر بە ناوچاویەوەیە» «أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ ... وَقَالَ لِي: «هَلْ لَكَ مَالٌ؟»

---

(١) «مسند أحمد» (١٦٩٥٥)، وإسناده شامي جيد. «الصحيحة» (٢٢٦٩). قيل: المراد فرس الجهاد. و«ينقي» من الإنقاء أو التنقية. «يعلقه عليه»: واتە بیبەستێتەوە بە دەمیەوە.

(٢) «مسند أحمد» (١٨٣/٤) و(١٨٤/٤)، و«سنن أبي داود» (٢٥٤٢). وصححه الألباني في «صحيح أبي داود».

قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ لِي مَالٌ، إِبِلٌ وَخَيْلٌ وَرَقِيقٌ، قَالَ: «عَلَيْكَ بِالْخَيْلِ فَارْتَبِطْهَا، فَإِنَّ الْخَيْلَ مُعَلَّقٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ»[١].

هەروەها ئەفەرموێ: «وشترداری عیززەتە بۆ خاوەنەکەی، ومەڕداری بەرەکەتە، وئەسپداریش، خێر وبێر لەنێو چاوانی ئەسپدایە هەتا ڕۆژی قیامەت»، وەك عوروەی بارقی ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «الْإِبِلُ عِزٌّ لِأَهْلِهَا وَالْغَنَمُ بَرَكَةٌ وَالْخَيْرُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٢].

هەروەها ئەفەرموێ: «ئەسپ خێر وبێر لەناو چاوانیدایە هەتا ڕۆژی قیامەت، وخاوەنەکانیشیان هاوکاری کراون لەسەر ئالف پێدانی، بۆیە دەست بهێنن بە ناوچاوانیدا ودووعای بەرەکەتیان بۆ بکەن...»، وەك جابر ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «الخَيْلُ مَعْقُودٌ في نَواصِيها الخَيْرُ [وَالنَّيْلُ] إلى يومِ القِيامَةِ، وأَهْلُها مُعانُونَ عليها، فامْسَحُوا بِنَواصِيها، وادْعُوا لَها بالبَرَكَةِ، وقَلِّدووها لا تُقَلِّدووها الأَوْتارَ»[٣].

---

(١) «التاريخ الكبير للبخاري» (١٨٤/٢)، و«مسند أحمد» (٤٨٤/٣)، و«المعجم الكبير» (٦٤٨٠) وإسناد البخاري جيد. والحديث أورده الهيثمي في «المجمع» (٢٥٩/٥) مختصرا، وقال: «رواه البزار، ورجاله ثقات». «الصحيحة» (١٩٣٦).

(٢) «سنن ابن ماجه» (٢٣٠٥)، و«مسند أبي يعلى» (١٦١٤/٤). وصححه البووصيرى (٤٠/٣)، وإسناده صحيح على شرط الشيخين؛ «الصحيحة» (١٧٦٣).

(٣) «مسند أحمد» (١٤٧٩١)، و«المعجم الأوسط» (٨٩٨٢)، وحسنه الألباني في «صحيح الجامع» (٣٣٥٦)، والأرناؤوط في تحقيقه للمسند. فلفظ في نواصيها الخير كما قال صاحب «مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح» (٣٩٢/٧) (٣٨٦٧): «حديث متواتر أو كاد أن يتواتر فهو مشهور بلا شبهة».

ئەمە یەکەم.

## دیاردەکانی نەخوێندەواری یان چەواشەکاری

**دووەم، ئەڵێم:** کێ داوای لە تۆ کردووە مەڕ وبزن سەر نەبڕی ووشتر سەر ببڕی؟! تۆ مەڕەکە بۆ خوا سەر دەبڕی تا وشترەکە سەر ببڕی؟ دروستتر بڵێم: کام دەق لە قورئان وحەدیس داوای لێتکردووە مەڕ سەر نەبڕێت وحوشتر سەر ببڕی؟! ئەگەر هەیە با بیهێنێت، ئەگەریش نیە دیسانەوە ئەمە نیشانەی نەزانی ونەخوێندەواری ئەو وهاوشێوەکانیەتی بە ئیسلام.

ئەمە دوو.

**سێیەم،** کە ئەڵێ: «**لای ئەوان هیچ نەبووە حوشتری سەر بڕیوە حەڵاڵی کردووە**»، ئاخر ئەمە عەیبەیەکی گەورەیە وهەڵەیەکی کوشندەیە ونەنگیەکی مەزنە ونەزانیەکی ڕاشکاوانەیە وسەردەرنەکردنێکی ئێجگار زلە لە مێژو، مەعقولە کەسێك بێت ڕەخنە لە ئیسلام بگرێت قسەی وا بکات؟!

نەخێر لای ئەوان ئاژەڵی تر لە مەڕ وبزن ومانگا وهتد.. هەبوون وزۆریش هەبوون کەسێکیش تۆزێ سەیرێکی کردبێ ڕێی لێدەکەوێ. کەواتە دیسانەوە بەڵگەی سەردەرنەکردنە لە ئیسلام ونەخوێندەوار بوونە لە ئاستی بەڵکو سەر دەرنەکردنە لە مێژوی عەرەبیش کە ڕەخنەی

لێدەگرێت. تەنانەت پەیامبەری خوا ﷺ بە برِ لێی بەخشیونەتەوە، چۆن نەبووە؟!

**چووارەم**، هەروەها ئاژەڵی تریشیان هەبووە وحەرامی کردووە، وەکو سەگ وپشیلە، کە لە حەدیسەکاندا ئەفەرموێ: لەو ئاژەڵانەیە کە زۆر لە دەوری دەستانن. «**إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ إِنَّمَا هِيَ مِنْ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ**»[1].

هەروەها پەیامبەر ﷺ لە شوێن دەمی پشیلە دەستنوێژی شُشتوە[2].

کەچی خواردنیشیان حەرامکراوە.

کەواتە تەنها حوشتریان هەبووە بۆیە حەڵاڵی کردووە، وتەیەکە مەحەللی لە ئیعرابدا نیە، وبەڵگەی نەخوێندەواریە بە ئیسلام.

**پێنجەم**: ئەڵێ: «**لای ئێمە ئەم مەڕە جوانەمان هەیە، حوشتر بۆ سەربریِن!**». کە لەم وتە ورد دەبیتەوە، ئەیەوێ بڵێ: وشتر ناشیرینە مەڕ جوانە. بۆیە ئەمیان با سەر ببڕین وئەویان نا، جا ئەمە قسەی کەسێکە

---

(١) «سنن أبي داود» (٦٩)، وله قصة: «أن امرأة أرسلت بِهَرِيسَةٍ إِلَى عَائِشَةَ ،فَوَجَدَتْهَا تُصَلِّي، فَأَشَارَتْ إِلَيَّ؛ أَنْ ضَعِيهَا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَأَكَلَتْ مِنْهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَتْ، أَكَلَتْ مِنْ حَيْثُ أَكَلَتْ الْهِرَّةُ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّمَا هِيَ مِنْ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ» وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِهَا».

(٢) كما سبق في الرواية المتقدمة، وفي «سنن أبي داود» (٦٨)، عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ –وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ-: «أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ، فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ، قَالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنْ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ». «تلخيص الحبير» (١/١٥) وفيه أن البخاري والدارقطني صححه.

کورد ئەڵێن عەقڵی لە چاویەتی، ئاخر لە کوێی ئەم سەرزەمینە پیاوی زانستی وئەکادیمی بە جوان وناشیرینی قسە دەکات؟! ئەمە لە کەیەوە جوانی وناشیرینی بووە بە پێوەر؟!

## گۆشتی وشتر خۆشە یان بەراز؟

ئەڵێ: «**دەی بە ویژدانتان گۆشتی وشتر خۆشە یان هی بەراز؟**»

**لە وەڵامدا ئەڵێم:** من بۆ خۆم تامی هیچ کامیانم نەکردووە تا بزانم؟! وزۆرێکی ئەو خەڵکە موسڵمانەش بڕوا ناکەم خواردبێتیان، ئەوەی یەکەم بەهۆی بێموچەییەوە وئەوەی دووەمیشیان بەهۆی حەرامێتیەوە.

پاشان ئێمە لە کوردستان ئەژین نە وشتری لێیە نە بەراز ئیتر نازانم ئەم **خەمخۆری** وبەرگریکردن وبەتەنگەوە بوونە بۆ بەراز بە چ لۆژیکێک دەکرێت؟!

بەڵام دەزانم لێکۆڵینەوە زانستیەکان گۆشتی وشتر بە باشتر وتەندروستتر دەزانن لە گۆشتی بەراز، بەڵکو گۆشتی بەراز بە زیانبەخش دەزانن.

هەروەها دەزانم وشتر شەریفتر وبەسودتر وبەوەفاترە لە بەراز. بەڵکو لە ڕاپۆرتێکی کەناڵی جەزیرەدا باسی وشترێکی دەکرد لە گوندێکی یەمەن سەر بە پارێزگای «ئیب»، ئەوە هەفتەیەك زیاترە خاوەنەکەی کە ناوی حاجی نەعنەعە مردووە، کەچی تا ئێستا قەبرەکەی بەجێنەهێشتوە

وهەرچـیش هـەوڵی لەگـەڵ دەدەن قەبرەکـە جێناهێڵێـت. ئـەو حاجیـە بەناوبانگ بووە لـە گوندەکـە کـە زۆر ئاژەڵدۆسـت بـووە، بۆیـە وشـترەکە شوێنی جەنازەکەشی کەوتوە تا سـەر قـەبران. کـوڕی کۆچـکردوو هـەوڵی زۆری لەگەڵ دابوو، فایدەی نەکردبوو. تەنانـەت جـاری وا هـەبووە بـە زۆر هێناویـەتیوە بـۆ ماڵـەوە بـەڵام دووبـارە گەڕاوەتـەوە بـۆ سـەر گـۆڕی خاوەنەکەی. تەنانەت لە ڕاپۆرتەکە ئەڵێ: هێشتا لای قەبرەکەیـە وبـەجێی نەهێشتوە.

## ڕای زانست لەبارەی گۆشتی بەرازەوە

هەڵبەت شتی زۆر هەبوو لەم بارەوە بیخەمە ڕو، بەڵام پێم باشە تـەنها ئەو شتانە باس بکەم کە لـە سەرچـاوە ئـەوروپی وئەمریکانـەوە ئامـاژەی پێدکرێت، بۆ ئەوەی گفتوگۆکە درێژە نەکێشێت ونەوترێ: دۆمە وکلاش بـۆ خۆی دەدوورێت، جا بە پشت بەستن بەو سەرچـاوانەی ئامـاژەی پێدەکـەم، ئەمانەی خوارەوە هەندێك زیانی بەرازە[1]:

- لە هەموو گۆشتێك خراپترە بۆ قەڵەوی[2].

---

(١) تەنانەت یەکێك لە ڕاپۆرتەکان ناویشانەکەی ئەمـەبوو بـە ئینگلیـزی: گـرنگترین دە هۆکار بۆ نەخواردنی گۆشتی بەراز.

(٢) سەرچاوە:

www.peta.org/living/food/top-10-reasons-eat-pigs

- هۆكارێكه بۆ توشبوون بـه نەخۆشـیەكانی شـەكرە ودڵ وئیلتهـابی جومگەكان وپوكانەوەی ئێسكەكان ونەخۆشی زەهـایمر ورەبـوو وبێتوانـایی جنسی.

- ئەمانەش لەبەر ئەوەی چـەوریەكەی بـەراز خراپـە ووەكـو چـەوری ئاژەڵەكانی تر نیە وزیانبەخشە[1].

- هەر ئەمەش ئەبێتە هۆی سەرەتانی مەمك[2].

- وازهێنـانی لـە خـواردنی گۆشـت وچـەوری بـەراز ئەبێتـە هـۆی كەمبونەوەی بەردی گورچیلە، وهەوركردنی نێو ڕیخۆڵەكان.

- ئەو پاشەڕۆیەی لە كێڵگەیەكی ٥٠٠٠ پێنج هەزار بەرازیـدا بـەجێ دەمێنێت، بە ئەندازەی ئەو پاشەڕۆیەیە كە شارێكی ٥٠٠٠٠ پـەنجا هـەزار كەسیدا بەجێ دەمینێت[3].

- پاشـەڕۆی بـەراز ئەوەنـدە زیانبەخشـە، هەنـدێك كۆمپانیـا پـێش هەوادانی ماددەی كیمیایی تری تێكەڵ دەكەن پاشان لە شـوێنێكی چـۆڵدا

---

(١) هەمان سەرچاوە. لەگەڵ:
/https://nutritionfacts.org/topics/pork

(٢) سەرچاوە: http://foodforbreastcancer.com/foods/pork
لەگەڵ: /https://nutritionfacts.org/topics/pork

(٣) هەمان سەرچاوە.

دەیرێژن تا خەڵك هەواكەی هەڵنەمژن، هەموو ئەمانـە بـۆ كەمكردنـەوەی زیانەكانی لەسەر ژینگە[1].

- تەنانەت لە ساڵی ١٩٩٥، ٢٥ بیست وپێنج ملیۆن گاڵۆن لـە میـز وپیسایی بەرازیان ڕشاندە نێو ڕوبارێك لـە كارۆلینـا، ئـەوەبوو ڕاسـتەوخۆ بووە مایە كوشتنی ١٠ بۆ ١٤ دە بۆ چواردە ملیۆن ماسی[2]!

- بـەهۆی ئـەو ژینگەیـەی بـەرازی تێـدا گـەورە دەبێـت بـەكتریای زیانبەخشی زۆری پێوەیە[3].

- جگە لەو بەكتریایانەی كە لـە ڕیخۆڵـەی بـەرازدان، كـە كاریگـەری دەكەنە سەر مێشكی مرۆڤ وتەنانەت هەندێك جـار ئەبێتـە هـۆی پەركـەم وسەرع لە گەنجدا[4].

- ٧٠٪ بەرازەكان پێش سەربڕین نەخۆشیان پێوەیە[5].

- كاتێك بەراز خواردنێك دەخوات بەهۆی ئەنـدامی هەرسـكردنیەوە، بۆی هەیە لە پاشەڕۆوە لەماوەی نزیكەی چـوار كاتـژمێردا فڕێـی بـدات، بۆیــە بــەجوانی پاڵفتــەی خواردنــەكان ناكــات ومــاددە ســـودبەخش

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) سەرچاوە:
/https://nutritionfacts.org/topics/pork

(٥) هەمان سەرچاوە.

وزیانبەخشەکان جیاناکاتەوە وبۆیە کۆمەڵێك ماددەی زیانبەخش لە لاشەیدا دەمێننەوە، بەڵام بۆ نمونە لە ئاژەڵێکی وەك مانگادا بیست وچووار سەعاتی پێدەچێت، وبە جوانی هەرسی دەکات ومادده سود بەخشەکان دەخوات وزیانبەخشەکان فڕێ دەدات[١].

- بەراز عارەق ناکات زۆر بە کەمی نەبێت بەهۆی نەبوونی کونی پێویست لەلەشیدا، ئەو ئارەقەش یارمەتی ڕژانی مادده ژەهراویەکان دەدات، بەڵام لەبەرازدا ئەوە نیە بۆیە کۆ دەبێتەوە وئەبێتە زیان بۆ گۆشتەکەی[٢].

- بەراز عارەق ناکات زۆر بە کەمی نەبێت بەهۆی نەبوونی کونی پێویست لەلەشیدا، ئەو ئارەقەش یارمەتی ڕژانی مادده ژەهراویەکان دەدات، بەڵام لەبەرازدا ئەوە نیە بۆیە کۆ دەبێتەوە وئەبێتە زیان بۆ گۆشتەکەی[٣].

- بۆیە پێستی بەراز پیسترین شوێنی لاشەی بەرازە[٤].

---

(١) وتەی دکتۆر: «Dr. Josh Axe». پسپۆری خۆراك وخەبیری تەندروستی ئەندامی هەرسکردن. کە لە ئەوروپا وئەمریکا ملیۆنان بینەر وگوێگری هەیە. وسایتەکەی ساڵانە ١١,٠٠٠,٠٠٠ یانزە ملیۆن کەس سەردانی دەکات.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) سەرچاوە:
/https://nutritionfacts.org/topics/pork

- گۆشتی بەراز خواردن ئەبێتە مایــەی تێکچـونی مــەزاج وتاقــەتی مرۆڤ[1].

- کرمێك لە گیانی بەرازدایە تەنانــەت لــەکاتی کولاَندنیشــدا لــەناو ناچێت. کە لەگەڵ خواردنی ئەو کرمەدا دووای هەفتەیــەك توشــی ئەمانــە ئەبێت: سەر ئێشە، بەرزبوونەوەی پلەی گەرما، ... [2].

- بەراز ڤایرۆسێکی زۆری لەخۆی هەڵگرتوە، کە ئەبنە هۆی نەخۆشی بۆ مرۆڤ بۆ چەندینساڵ[3].

- گۆشــتی بــەراز ئەبێتــە مایــەی شــێرپەنجەکانی کۆئەنــدامی زاوزێ ودەرەچە[4].

- گۆشتی بەراز کێشە لە جگەر دروستدەکات[5].

- وەك دەردەکەوێت بەراز دەریا وخەزێنەی ڤایرۆسە[6].

Pigs appear to be reservoirs of the virus.

- گۆشتی بەراز ئەبێتە مایەی سەرئێشەیەکی زۆر[1].

---

(١) سەرچاوە: /https://nutritionfacts.org/topics/pork

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) سەرچاوە: /https://nutritionfacts.org/topics/pork

(٥) هەمان سەرچاوە.

(٦) هەمان سەرچاوە.

- گۆشتی بەراز ئەبێتە هۆی سەرەتان[٢]. تەنانەت لەگەڵ جگەرە کێشاندا جیاوازی نیە بۆ توشبون شێرپەنجە[٣].

- بەراز تاکە ئاژەڵێکە پاشەڕۆی خۆی دەخوات بە چاوی خۆمان بینیومانە.

- بەراز تاکە ئاژەڵێکە بێچووی تۆپیوی بەراز دەخوات. بە چاوی خۆمان بینیومانە.

زیاتریش هەبوو بەس با ئەوەندە بەس بێت.

## ڕای زانست لەبارەی حوشترەوە

لەم بارەوە شتی زۆر هەبو لە سەرچاوە ئیسلامیەکان لەبارەی سودە زۆرەکانی گۆشت وشیر وتەنانەت میزی وشتریشەوە، بەلاّم من سوربوم لەسەر ئەوەی وشەیەکیش لەو سەرچاوانەوە نەگوازمەوە، بەڵکو هەموی لە سەرچاوە بیانیەکان بێت، جا ئەم سودانەمان بەرچاو کەوت، پێش چونە خزمەت لێکۆڵینەوەکان ئەو ئایەتەتان بیر دەهێنمەوە: ﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) سەرچاوە:
http://www.nbcnews.com/health/cancer/processed-meat-causes-cancer-red-meat-probably-does-group-says-n٤٥١٣٩٦

(٣) سەرچاوە:
http://www.telegraph.co.uk/news/health/news/119[illegible]/Bacon-ham-and-sausages-as-big-a-cancer-threat-as-smoking-WHO-to-warn.html

الْأِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾. [الغاشية:١٧]، واتــه: «ئــەی تەماشــای وشــتر ناكــەن چــۆن دروستمان كردوه وچۆن جیاوازه له ئاژەڵەكانی تر!».

- وشتر توانای ڕێكردنی هەیه لــه ســەرو ٧٠ پلــەی ســەدی گــەرمی هەیه، وله خوار ٥٠ پەنجا پلــەی ســەدی گــەرمی هەیــه، كــه ئەمــه دژی یاسای گەشەسەندنه[1].

- سیستەمی سوڕی خوێنی وشتر به پێچەوانەی مــرۆڤ وئــاژەڵانی تــر وەك وڵاخەكان ئیشت دەكــات، ونیزامــی ئۆكســجینی خــوێن لــه ئاژەڵــدا باشترین حاڵەتی هەیه ولەوانی تر باشتر ئیش دەكات[2].

- وئەو خڕۆكه سورانەی بەرپرســن لــه گواســتنەوەی ئۆكســجینی نــاو خوێن كه پێی ئــەوترێ: «opt.HCT» باشــترینی حاڵــەتی لــه وشــتردایه، چونكه جوانتر وڕێكوپێكتر ئیش دەكات[3].

- خڕۆكه سورەكانی خوێن له وشتردا زۆر زۆره، ئەمەش یارمەتیــدەره بۆی لەكاتی زۆر ڕۆیشتن وخەست بونەوەی خوێنیدا، كاریگەری زۆر نــەبێت لەســەری چــونكه ئۆكســجینێكی زۆری لــه خوێنــدا هەیــه. ئەمــەش بــه

---

(١) سەرچاوە:
http://www.pnas.org/content/١١٣/٢٤/٦٧٠٧.full

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

پێچـــەوانەی مـــرۆڤ وئـــاژەڵانی تـــر لەوکاتانـــەدا جوڵـــەی کەمدەبێتـــەوە وهەندێکجار ئەبێتە هۆی مردنی[1].

- شیری وشتر شیفای تێدایە بۆ چەند نەخۆشیەك، لەوانە: شەکرە، کـە هەرکەس بە بەردەوامی بیخوات حاڵەتەکەی بەرەو باشتر دەڕوات[2].

- هەروەها نەخۆشی تۆتیزم[3].

- هەروەها نەخۆشی تالاسیما[4].

- هەروەها نەخۆشی زیپکە وپەڵەی دەموچاو[5].

- هەروەها نەخۆشی ئازاری ئەژنۆ[6].

- هەروەها سودی هەیە بـۆ نەخۆشـی ئایـدز (ئـێچ ئـای ڤـی)، کـە ئەوانەی توشی دەبـن، بـۆ یارمەتیـدانی پاکبونـەوە لـەو ڤایرۆسـە شـیری وشتریان پێدەدرێت[7].

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) هەمان سەرچاوە.

.stm۸۲۸۵۸۱۷/hi/europe/۲http://news.bbc.co.uk/

(٣) https://caloriebee.com/nutrition/What-are-the-Benefits-of-Drinking-Camel-Milk

(٤) هەمان سەرچاوە.

(٥) هەمان سەرچاوە.

(٦) هەمان سەرچاوە.

(٧) هەمان سەرچاوە.

- هەروەها ئەو وەرەمانەی نەخۆشی شیرپەنجە دروستی دەكات، شـیری وشتر بەسودە بۆ دژ وەستانەوەی[١].

- شیری وشـتر لـە ئاینـدەدا ئەبێتـە یـەكێك لـە شـیرە بەسـودەكانی ئەوروپا[٢].

- بەبـەردەوامی خـواردنی شـیری وشـتر پـیری دوا دەخـات، بـەهۆی پێكهاتەكانیەوە[٣].

- گورچـیلەی وشـتر لــە هەنــدێ ڕووەوە زۆر جیــاوازترە لــە هــی ئاژەڵانیتر[٤].

- بەبەراورد لەگەڵ گۆشتەكانی تردا وەك گۆشتی مانگا ومـەڕ وبـزن، گۆشتی وشتر لە هەمو گۆشـتە سـورەكانی تـر شـیاوترە ولـە نەخۆشـیەوە دورترە، كەمترین زیانی بۆ دڵ هەیە لەبەر كەمی ڕێژەی چەوری تێیدا.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

هەروەها:

www.nanoscienceworks.org/articles/nanobodies-from-camels-show-promise-in-safely-killing-cancer-cells

(٢) سەرچاوە:

news.bbc.co.uk/٢/hi/europe/٧٨١٥٨٢٨.stm

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) سەرچاوە:

http://ajplegacy.physiology.org/content/١٨٨/٣/٤٧٧.abstract

- حاڵەتەکانی توشبون بە نەخۆشیەکانی دڵ کەمدەکاتەوە[١].

- زۆر بەسودە بۆ کەسێك ڕێجیم بکات[٢].

- میزی وشتر هیچ زیانێکی تەندروستی نیە، تەنانـەت دەکرێـت وەك دژە میکـرۆب بـەکار بهێنرێـت، تەنانـەت بـۆ چارەسـەری کۆمـەڵێك نەخۆشیش[٣].

---

(١) سەرچاوە:
http://archive.aawsat.com/details.asp?article=٩١٥٠&issueno=٢٠٧٩٧٣.WWQDnojyvIU#

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) بۆ سەرچاوەی ئەو وتانەم لەبارەی میزی وشترەوە بڕوانە:

١. http://esciencecentral.org/journals/effects-of-heating-and-storage-on-the-antifungal-activity-of-camel-urine-2327-[illegible].php?aid=35791
٢. http://www.jbc.org/content/٦٤/٣/٦١٥.short
٣. http://iiste.org/Journals/index.php/JNSR/article/view/٢٣٣٦
٤. http://www.sciencedirect.com/science/article/pii/S٢٢١٠٥٢٢٠١٣٠٠٠٥٠٦
٥. http://www.sciencedirect.com/science/article/pii/S٠٣٧٨٨٧٤١١٢٠٠٥٢٣٥
٦. http://www.academia.edu/١٠٣٣١٠٥٤٠/Market_Research-Camel_Urine
٧. http://faculty.ksu.edu.sa/shoeib/Pages/CamelUr%٢٨E%٢٩ineAbst.aspx

## قوربانیەکانی دەستی ئیسلام ودەستی عەلمانیەت

ئەڵێ: «**قوربانیەکانی دەستی مەسیحی وئیسلام بژمێری دە ملیۆن تێدەپەڕێنێت**».

ئەگەر لێکۆڵینەوە هەیە لەو بارەوە با بهێنرێت، کە نیشە عەیب نیە مرۆڤ لە خۆیەوە وبە ناوی زانستەوە لە کۆنفرانسێکدا بە خەملاندن ومەزەندە قسە بکات؟!

دابنێ وایە[1]: تو ویژدانتان! تەنها لە دووای شۆڕشە مەزنەکەی! فەرەنساوە کە بە شۆڕشی مافەکان ودیموکراتی وئازادی ویەکسانی ناسراوە،

---

(١) هەڵبەت وەکو سەردەمی پەیامبەر ﷺ لە یەکی کۆچیەوە بۆ ١١کۆچی کە تێیدا پەیامبەر ﷺ وەفات دەکات: ژمارەی هەموو کوژراوانی هەردوو لا لە کافران وموسڵمانان نزیك لە ١٠٠٠ کەس بووە یان هەندێك زیاتر. ژمارەی موسڵمانان ٢٥٩ کەس بووە وژمارەی بەرامبەرەکانیان ٧٥٩، ژمارەی برینندارەکانیش ١٢٧ کەس بووە. «**رحمة للعالمين**» **للمنصورفوري، ترجمة د. سمير عبد الحميد، دار السلام، الرياض**.

ئەمە جگە لەوەی لە ئیسلام پاڵەوانتر لە شەڕ وبە بەزەییتر دەست ناکەوێت، ئەوەش ول ديورانتی ڕۆژهەڵاتناس لە «**قصة الحضارة**» (٣٨٣/١٣) ئەڵێ: «بەڕاستی موسڵمانان وەك دەردەکەوێت پیاو بن یان ژن لە مەسیحیەکان تەواوترن، چوونکە لە پەیمانە توندتر بوون، بەژێر دەستە بە ڕەحمتر بوون، کەمجار لە مێژوویاندا وەحشیگەریان ئەنجامداوە وەك ئەوەی مەسیحیەکان کردیان کاتێك دەستیان گرت بەسەر بیت المقدسدا ساڵی ١٠٩٩». «**إن المسلمين -كما يلوح- كانوا رجالًا أكمل من المسيحيين، فقد كانوا أحفظ للعهد منهم، وأكثر منهم رحمة بالمغلوبين، قلما ارتكبوا في تاريخهم من الوحشية ما ارتكبه المسيحيون عندما استولوا على بيت المقدس في عام ١٠٩٩م**».

هەروەها ڕێژەی کوژراوەکان لە ڕیزی سەربازەکانی ئیسلامدا تەنها ١% یا هەندێك زیاتر بووە، بەڵام ڕێژەی کوشتار لە جەنگی جیهانی دووەم بە نمونە وەربگرین ٣٥١% بووە. چوونکە

چەند کەس کوژراوە؟! بەڵکو چەند ماڵ کاول کرا؟! کە دەسەڵاتی پاپا لە گۆڕنرا ولەلای عوسمانیەکانیش ئیسلام لە پەراوێزدا بوو؟!!

بەڵکو تەنها باسی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ بۆ ١٩١٨) وجەنگی جیهانی دووەم (١٩٣٩ - ١٩٤٥) بکەین.

دەی دە ملیۆن[١] وپەنجا ملیۆن[٢] بەلای کەمەوە بژمێرە بزان چەند دەکات؟ شەست ملیۆن.

دەشترسم هەم بپرسێ: تو ویژدانتان شەست ملیۆن زۆرترە یان دە ملیۆن؟!

---

نزیکەی ١٥,٦٠٠,٠٠٠ سەرباز بەشدار دەبێت، بەڵام کوژراوەکان دەگەنە نزیکەی: ٥٤,٨٠٠,٠٠٠.

بۆ ژمارەی جولەکەکانیش کە چەندیان کوشتوە، بڕوانە: «الغرب والإسلام، أين الخطأ وأين الصواب» لمحمد عمارة، مكتبة الشروق الدوولية، الطبعة الأولى ٢٠٠٤، (ص ١١٦-١١٧).

هەر بڕوانە هەمان سەرچاوە بۆ ژمارەی شەڕ وکوشتاری گاورەکان.

بۆ ژمارەی کوژراوانی شەڕەکانی تر، بڕوانە کتێبی: «موسوعة الحروب»، هيثم جمعة هلال، دار المعرفة، الطبعة الثانية ٢٠٠٨. و«معجم المعارك التاريخية» تأليف: نجاة محمود محايس، دار زهران للنشر والتوزيع، الطبعة الأولى ١٤٣٢، الأردن.

(١) لە کتێبی: «موسوعة الحروب»، هيثم جمعة هلال، ص٤١١، ئەڵێ: دە ملیۆن کوژراوە وبیست ملیۆن بریندار بووە. وسەد وشەست وهەشت ملیار دۆلار خەرجی بووە، وبایی نزیکەی دوو سەد ملیار دۆلار کاولکاری کراوە.

(٢) لە کتێبی: «معجم المعارك التاريخية» ص٣٥٠ ، ئەڵێ: یەك تریلیۆن دۆلار ئەمریکی خەرجی بووە، بە پێی خەمڵاندنی ساڵی ١٩٤٤. ولە کتێبی: «موسوعة الحروب» ص٤٤٥، ئەڵێ: «ملیار ونیوێك قوربانی لێ کەوتۆتەوە»، واتە: بریندار وپێوە بوو وکوژراو هتد...

کەواتە ماڵت لە شوشەیە بەرد لە ماڵی خەڵك مەگرە[1].

---

(١) ئەگەر باسی شەڕەکانی تریش بکەین، هەمتر دەبینین، کە کەم نیە، لەوانە: تەتەرەکان ملیۆنێك موسڵمان دەکوژن، «وقد اختلف الناس في كمية من قتل ببغداد من المسلمين في هذه الوقعة. فقيل ثمانمائة ألف، وقيل ألف ألف وثمانمائة ألف، وقيل بلغت القتلى ألفي ألف نفس، فإنا لله وإنا إليه راجعون ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم.» «البداية والنهاية» لابن كثير، تحقيق: عبد الله التركي، دار عالم الكتب، الطبعة الثانية ١٤٢٤.

هەروەها: هندیە سورەکان ژمارەیان نزیکەی ١٥٠ ملیۆن کەس دەبوو لە ئەمریکا، هەموویان لەناو براون، ئەڵێن: یەك ملیۆنیان ماوە.

هەروەها ڕوسیای قەیسەر لە قەتڵوعامێکدا ١٥٠٠٠٠ هەزار موسڵمان دەکوژێت.

هەروەها خەڵك هێشتا هێرۆشیما وناکازاکیان لەبیر نەڕۆیشتۆتەوە، کە بەهۆی قونبەلەی نەوەویەوە ئەمریکا لە یابانیدا لە یەکەمدا ٧٠٠٠٠ ولە دووەمیشدا ٦٠٠٠٠ ڕاستەوخۆ گیانی سپارد، کە لەوەو دووا یابان خۆی ڕای گەیاند ژمارەکە بەرز بۆتەوە بۆ ٢٣٠٠٠٠. بریندارەکانیش گەیشتونەتە ١٥٧٠٠٠.

هەروەها «ماو تسی تونگ» کە لە کوردستاندا لەگەڵ ئەلیف وبادا تەعالیمەکانی بە خەڵك دەدرا، خۆی ئیعتراف دەکات کە لە ساڵی ١٩٥١ بە مەبەستی کپکردنەوەی شۆڕشە بەرهەڵەستکاریەکەی دژی نزیکەی ٨٠٠,٠٠٠ لەوانەی دژی سیاسەتەکەی بوون لەناو بردووە، هەروەها شانازی دەکات کە ٤٦,٠٠٠ زانا بە زیندوویەتی لە گۆڕناوە! بڕوانە: «الصين» لكونراد زايتس (ص ٢٥٤) نقلًا عن: «()».

هەروەها لە شەڕی بۆسنە وهرسك لە ساڵی ١٩٩٢ بە پێش چاوی دوونیاوە بەپێی خەملاندنی نەتەوە یەکگرتوەکان لە نێوان ٢٠٠٠٠ بۆ ٥٠٠٠٠ پیاو وژن بووە کوژراوە. «تەنانەت ٣٠٠ گۆڕی بە کۆمەڵ دۆزرایەوە کە هەر گۆڕێکیان هەزاران لاشەی شوێندراوی

ئەمانە عەلمانیش بوون، چوونکە جەنگی جیهانی دووەم دەرکەوتنی میحوەری ئەڵمانیا ورۆما بوو، یەکەمیان هیتلەر بوو دووەمیش مۆسۆلۆنی، وهەردووکیشیان عەلمانی بوون وبڕوایان بە جیاکردنەوەی دین بوو لە دەوڵەت.

## هەرشتێك لەگەڵ دابوونەریتدا نەگونجێت نابێت قانونی بۆ دابنرێت؟

ئەڵێ: «**وتویەتی هەرشتێك لەگەڵ دابوونەریتدا نەگونجێت نابێت قانونی بۆ دابنرێت**».

---

موسڵمانانی تێدا بوو.. ئەمەش بە تەدریب وڕاهێنانی ئەفسەرە ئیسرائیلیەکان» «**موسوعة الحروب**» (ص ٤٩٤). **إنا لله وإنا إليه راجعون**.

هەروەها لە شیشاندا، ژمارەی قوربانیەکان نزیکن لە ١٠٤٠٠٠ موسڵمانەوە کە زۆربەیان مەدەنی وژن ومنداڵ بوون، کێ کوشتنی؟ «**تاريخ القوقاز**» **محمود عبد الرحمن، دار النفائس، بيروت، الطبعة الأولى ١٤٢٠**. (ص ١٩٣). و«**موسوعة الحروب**» (ص ٤٩٥ – ٤٩٨).

تەنانەت ئەمریکا لە شەڕی ڤێتنامدا دەرمانی لەناوبردنی دار وگژوگیا بە کاردەهێنێت بۆ لەناوبردنی جەنگەڵ وگژوگیا فراوانەکەی ڤێتنام. کێ لە دەست ئەمریکا سەلامەت بووە؟! تەنانەت ئەم کارە نارەزایەتیەکەی گەورەی نێودەوڵەتی لێکەوتەوە لە ساڵی ١٩٧٠. بڕوانە: «**معجم المعارك التاريخية**» (ص ٣٩٧). ئەمە جگە لە کوشتنی ٣٠٠٠٠٠٠ ڤێتنامی لەم شەڕەدا بە دەستی ئەمریکا.

جا نازانم لەو پارچە ڤیدیۆیە دیار نیە ئیسلام وای وتوە یان ماموٚستایانی ئایینی؟

هەرچۆنێك بێت وهەرکامیان بێت بەڵگەی نەخوێندەواریە لە ئاست ئیسلام.

چوونکە ئەگەر مەبەستی ئیسلام بێت، ئەوا هەرگیز ئیسلام شتی وای نەفەرموە وبووهتانە بۆی دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی کە ئیسلام خۆی هاتوە دەیەها دابوونەریتی نێو عەرەبی گۆڕیوە ویاسای شەرعیشی بۆ داناوە.

ئەگەر ماموٚستایەکیش وای وتبێت لەگەڵ ڕێزم بۆی، ئەوە ماموٚستا تەعبیر لە ڕای خۆی دەکات نەك ئیسلام وەکو لەلای شەرعزانان مەعلومە ویاسایە لەلایان: «قسەی شەرع زان بە بەڵگە ناهێنرێتەوە بەڵکو بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە»، ئەمە جگە لەوەی ئەم وتەیە زیاتر لە خوێندنەوەی هەڵوێست دەچێت تا ئەوەی ماموٚستایەك شتی وای وتبێت.. کەواتە دیسانەوە نیشانەی ناشارەزاییانە بە ئیسلام.

پاشان ئەو دابوونەریت شکاندنە چیە؟ ئەگەر ستەمکردنە لە ژن، منیش دەڵێم با یاسا دەربکرێت وڕێگری لێبکات وسەیری دابوونەریت ناکەین، ئەگەریش ئەو دابوونەریت شکاندنە، مارە کردنی نێرە لە نێر ومێ

له مێ، ئەوا چاك وایە جورئەت بکەن وڕوونتر بیڵێن تا ئەو خەڵکە بزانێت، بە نیازن ڕێگە بە زەواجی نێوان کەر ومرۆڤ بدەن!

## تێنەگەیشتن لە حەدیسی پەیامبەر ﷺ

ئەڵێ: «**لە سکماکەوە سەپاندنی ئاین پەرستی بۆ؟!**».

دیارە وەك لە قسەکانی دەردەکەویت وئاماژەی پێدەکات، مەبەستی حەدیسی: «**كلُّ مولودٍ يُولَدُ علي الفطرةِ**»[1]یە، جا ئەمەش هەر نیشانەی نەخوێندەواریە بە ئیسلام وبە خودی ئەو حەدیسەی دەهێنرێتەوە.

چۆن؟ چوونکە حەدیسەکە بەم شێوازەیە: «**كلُّ مولودٍ يُولَدُ علي الفطرةِ ، فأبوواه يُهَوِّدانِه، أويُنَصِّرانِه، أويُمَجِّسانِه، كمثلِ البَهِيمَةِ تُنْتِجُ البَهِيمَةَ، هل ترى فيها جَدْعَاء؟**». واتە: «هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت، ئەوە دایك وباوکین دەیکەن بە جولەکە، یان گاور، یان مەجوسی، وەکو ئاژەڵ دەزێ وبێچووی دەبێت، هیچ عەیبێکی تیا دەبینن“ گوێی بڕا بێ، یا لوتی یا...؟».

جا ئەو وهاوبیرانی وا تێدەگەن کە ئەمە سەپاندنی ئاینی ئیسلامە، باشە ئەگەر بە زۆر سەپاندنی ئیسلامە ئەی ئەوە چیە فەرمودەکە ئەفەرموێ: «دایك باوکی دەیکەن بە جولەکە یان گاور یان مەجوسی؟!».

بەڕاستی بەزەییم دێتەوە بەو عەقڵەیان وا بیری پێدەکەنەوە.

---

(١) «صحيح البخاري» (١٢٩٢) (١٣١٩)، و«صحيح مسلم» (٢٦٥٨).

# هەر لە دین بێئاگا نین، لە واقعیش بێئاگان

ئەڵێ: بە پێی یاسای ئیسلام هەموو پیاوێك ئێستا دەتوانێ زۆر بە ئاسانی بە ٥ دۆلار چووار ژن بهێنێت.

سەرەتا ئەڵێم: وامزانی ئاگایان هەر لە دین نیە، بەڵکو دەرکەوت ئاگایان لە واقعیش نیە، ناهەقیشیان نیە دیارە لە کۆشکەکانیان خەوتون ونەهاتونەتە ناو میللەت بزانن ئەو مللەتە تا ژنێك دەهێنێت بە چ ڕەزالەتێك ئەو پرۆسەیە تەواو دەکات.

یان ئەشکرێ لەگەڵ ئەو ئافرەتە داوێن پیسانە لێیان تێکەڵ بووبێ کە لەشفرۆشی دەکەن وبە پێنج دۆلار دەست دەدەن.

ئینجا لە ڕاستیدا ئەمە لە دین وشەریعەت ویاساکانی ئیسلامدا نیە ئیتر نازانم لە کام دین بەرچاوی کەوتوە ولەگەڵ ئیسلام لێی تێکەڵ بووە.

وبە قسەی هیچ زانایەك لە زاناکانی چووار مەزهەبەکە وجگە لەوانیش لە زانایانی ئیسلام شتی وانابێت.

چۆن؟ هەر زۆر بە کورتی یەکێك لە مافە سەرەکیەکانی ئافرەت ئەبێت پیاو شوێنی نیشتەجێبوونی سەربەخۆ بۆ هاوسەرەکەی دابین بکات، دەی ئەگەر بە بێ مارەییش شوی پێبکەن، وهیچ دیاریان بۆ نەکات وهەر بە کرێش خانویان بۆ بگرێت وخانویان بۆ نەکرێت، وهەر خانویەك بە ٥ دۆلاریش بێت: بیست دۆلار دەکات!؟ ئیتر بە چ عەقڵێك؟ بە کام حاسیبە؟

به چ خوێندنەوەیەك؟ بە پێنج دۆلار دەتوانێ چووار ژن بهێنێت؟ جا ئەمە هەر نەخوێندەواری نیە بەرامبەر ئیسلام. بەڵکو بێئاگاییە لە واقیعیش.

## کوێی ڕاست بکەمەوە

ئەڵێ: «**چۆن چۆنی یەقینمان هەبێت کە قورئان دووای دەیان ساڵ لە دووای کۆچی دوواییی پەیامبەر[1] کۆکراوەتەوە ولە نێو سەدان هەزار فەرمودەی پەیامبەر[2] دووای سەدەیەك، فەرمودە بژێر کراون وباقیەکەی نەسێلمێندراون، چۆن چۆنی؟!**».

سەرەتا ئەڵێم: ئەمە پرسیار نیە بۆ وەڵامدانەوە، وەك لای بەلاغیەکان مەعروفە ئەم پرسیارە بۆ ئیستنكار ونکوڵیکردنە، واتە: ئەیەوێ بڵێت شتی وا نابێت.

ئینجا ئەڵێم: ئەڵێن: کابرایەك پرسیاری لە مامۆستایەك کردبوو، وتبووی: مامۆستا ئەوە کچی کام ئەولیا بوو کەوتە چاڵەوە لە سەنعان وسەگ خواردی؟! مامۆستاش فەرمو بووی: ماڵتان ئاوا بێ نازانم کوێیت بۆ ڕاست بکەمەوە.

ئەوەڵەن کچ نەبوو کوڕ بوو!

ئەولیا نەبوو ئەنبیا بوو!

---

(١) صلى الله عليه وسلم.

(٢) صلى الله عليه وسلم.

چاڵ نەبوو بیر بوو!

سەنعان نەبوو کەنعان بوو!

سەگ نەبوو گورگ بوو!

هەروەها نەشی خوارد!!

سەرەتا پرسیاری وا لە خوای تەعالا ناکرێت لە زانا دەکرێت.

جا بشکرێ لە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیدا ناکرێت.

ئینجا دووای دەیان ساڵ نەبوو دووای یەکساڵ بوو

ئینجا دووای سەدەیەك نەبوو حەدیس پالفتە کرا بەڵکو لە سەردەمی عوسمان بوو.

ئینجا: ئەم قسەیە کوێرەکە وکۆنە وباوی نەماوە وئێکسپایەر بووە، ئەمە شوبهەی ڕۆژهەڵاتناسەکانە ولە تەرازوی زاستدا نرخی پشقلێکی نیە.

دووای ئەوەش ئەڵێم: دووای دەیان ساڵ نەبووە بەڵکو دووای تەنها یەك ساڵ بووە لە کۆچی دووایی پەیامبەر ﷺ. دەی ئەمە بەڵگەی نەخوێندەواری ئێوە وهاوشێوەکانتان نیە کە نازانن قورئان کەی کۆکراوەتەوە وڕەخنەشی لێدەگرن؟! خوایەگیان نەخوێندەوارمان نەکەیت.

جا بزانە پەیامبەر ﷺ لەساڵی (١١ ك) وەفات دەکات، ولە ساڵی (١٢ ك) ڕاستەوخۆ دووای شەڕی یەمامە بە حەدیسی سەحیح ئەبووبەکر رضي الله عنه قورئانی کۆکردۆتەوە، لە ڕێگەی نوسەری وەحی زەیدی کوڕی

سـابتەوە رضي الله عنه[١]، بـە شـێوەیەك: کـە ئایـەتێکی نەنوسـیوەتەوە هـەتا جەماعەتێك[٢] شاهیدیان بۆ نەدابێت.

وەکو ئێستا چۆن دادگا بە شایەتی دوو شاهید کە ئەگەر درۆزنیش بـن حوکم بەسەر کەسێکدا ساغ دەکاتەوە، یـان لای دەدات، بەهـەمان شـێوە، بەڵام شاهیدی لە ئیسلامدا مەرجی خۆی هەیـە کـە زۆر قورسـە ولـە زۆر کەسدا نیە.

---

(١) «صحيح البخاري» (٤٦٧٩، ٤٧٠١، ٤٧٠٣، ٦٧٦٨، ٦٩٨٩): «أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ -وَكَانَ مِمَّنْ يَكْتُبُ الْوَحْيَ- قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبوو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبوو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدْ اسْتَحَرَّ [اشتد] يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِالنَّاسِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ [حفظة القرآن] فِي الْمَوَاطِنِ، فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنْ الْقُرْآنِ، إِلَّا أَنْ تَجْمَعُوهُ، وَإِنِّي لَأَرَى أَنْ تَجْمَعَ الْقُرْآنَ، قَالَ أَبوو بَكْرٍ: قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِيهِ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ لِذَلِكَ صَدْرِي، وَرَأَيْتُ الَّذِي رَأَى عُمَرُ، قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: وَعُمَرُ عِنْدَهُ جَالِسٌ لَا يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ أَبوو بَكْرٍ: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ، عَاقِلٌ، وَلَا نَتَّهِمُكَ، كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَتَبَّعْ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ، فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنْ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ، قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلَانِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ النَّبِيُّ ﷺ؟ فَقَالَ أَبوو بَكْرٍ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ أَزَلْ أُرَاجِعُهُ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ اللَّهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقُمْتُ فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنْ الرِّقَاعِ [القطعة من ورق أو جلد ونحو ذلك] وَالْأَكْتَافِ وَالْعُسُبِ [جريد النخل العريض] وَصُدوورِ الرِّجَالِ، حَتَّى وَجَدْتُ مِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ آيَتَيْنِ مَعَ خُزَيْمَةَ الْأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهُمَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ﴾ إِلَى آخِرِهِمَا وَكَانَتْ الصُّحُفُ الَّتِي جُمِعَ فِيهَا الْقُرْآنُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ».

(٢) وقد تطلق على الاثنين أيضًا.

ئینجـا دووای سـەدەیەك حـەدیس بـژێر نـەكراوە، ئەمـە بەڵگـەی نەخوێندەواریە بە ئیسلام ، چـوونكە لـە دووای فیتنـەی عوسمانـەوە ﵁ دەست كراوە بە پاڵفتەكردنی فەرمودە، فیتنەی سەردەمی عوسمانیش ﵁ دەوری بیسـت وپێـنج سـاڵ بـووە دووای وەفـاتی پەیامبـەر ﷺ نـەك سەدەیەك.

هەروەكو شوێنكەوتوی پایەبـەرز پێشـەوا موحومـەدی كـوڕی سـیرین ڕەحمەت وڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: «هەرگیز پرسیاری سەنەدیان نـەدەكرد، بەڵام كە فیتنە كەوتەوە، ئەیانووت: كوا لـە كێتـان بیسـتوە؟! نـاوی ئـەو پیاوانە بێنن كە لێوەیتان بیستوون؟ ئیتر تەماشا دەكرا گەر ئەهلی سـوننە بووایە فەرمودەكانیان وەردەگـیرا، ئەگـەریش ئـەهلی بیـدەع بووایـە لێـی وەرنەدەگیرا»(1).

علي خان
١١ جمادي الآخرة ١٤٣٦
٣١ آذار ٢٠١٥

---

(١) مقدمة «صحيح مسلم» (١٥/١)، باب بيان أن الإسناد من الدين. «قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ: إِنَّ هذَا الْعِلْمَ دِينٌ؛ فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ. وَقَالَ: لَمْ يَكُونُوا يَسْأَلُونَ عَنِ الإِسْنَادِ، فَلَمَّا وَقَعَتِ الْفِتْنَةُ قَالُوا: سَمُّوا لَنَا رِجَالَكُمْ: فَيُنْظَرُ إِلى أَهْلِ السُّنَّةِ فيُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ، وَيُنْظَرُ إِلَى أَهْلِ الْبِدَعِ فَلاَ يُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ».

# پێڕستی بابەتەکان

## چاوەڕێی ئەم بەرهەمانە بن إن شاء الله تعالى:

- «الفقه الميسر» بە کوردی. خوای میهرەبان تەواو بوونی ئاسان بکا.

- «چرای ڕوناك لە سیرەی پەیامبەری ڕاستگۆی دەستپاك». تەواو بووە، خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات..

- «إتحاف الأخيار عن كيفية صلاة النبي ﷺ من حيث الإطالة والإختصار». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «تسهيل الرحبية». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «جیاوازی نێوان موسڵمانان، هۆكار وچارەسەر». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «تەبەڕوككردن وجۆرەكانی». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «پەروەردەكردنی منداڵان وبەرپرسیارێتی دایكان وباوكان». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «جیهانی جنۆكەو شەیتانەكان». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «ڕونكردنەوەی ناوە چاكەكانی خوای گەورە». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «وەفا وئەمەكداری پەیامبەری خوا ﷺ». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «چیرۆكی پەیامبەر یوسف ﷺ لە قورئان وفەرمودەدا». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «ئایا پەیامبەری خوا ﷺ سیحری لیكراوە؟!» تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «گفتوگۆیەكی نەرمونیان لەگەڵ د.عثمان». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «هەڵسەنگاندنی وتەی فەلسەفەخوازێك لە تەرازوی عەقڵ ومەعریفە وواقعدا». «وەڵامی فاروق ڕوفیق». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «نەرمونیانی لە ڕونکردنەوەی ٩٠ هەڵە وچەواشەکاری». «وەڵامی ... ڕاوی» تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «دووعا وپاڕانەوە». تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «کارەکانی دڵ». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «نەخۆشیەکانی دڵ». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «ڕۆژهەڵاتناسی وڕۆژهەڵاتناسان». «نامیلکە» خوای میهرەبان تەواو بوونی ئاسان بکات.

- «داوێن پیسی هۆکارەکانی، کاریگەریەکانی، چارەسەر». خوای میهرەبان تەواو بوونی ئاسان بکات.

- «شرح الكبائر» للذهبي. خوای میهرەبان تەواو بوونی ئاسان بکا.

- «ڕیبا چیە؟» خوای میهرەبان تەواو بوونی ئاسان بکا.

- «أين نحن من أخلاق السلف؟» بە کوردی. خوای میهرەبان تەواو بوون ولە چاپدانی ئاسان بکات.

- «رياض الصالحين». به كوردی. خوای میهرەبان تەواو بوون وله چاپدانی ئاسان بكات.

- «ئادابەكانی ئیعتكافكردن» تەواو بووە، خوا لە چاپدانی ئاسان بكا.

- «حوكمی وێنەگرتن لە فیقهی ئیسلامیدا» تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «گۆشتی بەراز خۆشە یان وشتر؟!» «گفتوگۆیەك لەگەڵ مەلا بەختیارس» (نامیلكە) تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.

- «ئەمە ئیبن تەیمیەیە» «وەڵامی پلاتفۆرمی دابڕان» تەواو بووە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بكات.